نـــاوی کتـێـب: هــەڵگــەرانــەوە
ناوی نووسەر: حسن علی بۆسکێنی
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنـــــوێن
دیزاینی تێکست: زەردەشـــت کاوانی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٢
چـــاپ: نـاوەندی ڕێنـوێن
تیــــراژ: (١٠٠٠) دانـــــە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (      )ـی ساڵی (٢٠٢٢)ـی پێ دراوە.









**ناوەندی ڕێنوێن**


07511408868 - 07501269689


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

# هەڵگەرانەوە

## حوکمی هەڵگەرانەوە لە ئیسلام

## لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سونەتدا

نووسینی

حسن علی بۆسکێنی



﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾

البقــرة.

پێشکەشە بە:

ڕووحی مامۆستای زانا و دانا و حەق ویست و
نەترس لە لۆمەی لۆمەکاران

بەڕێز: (پرۆفیسۆر دکتۆر مستەفا زەڵمی)

# پێشەکی

### بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

بابەتی هەڵگەڕانەوە یەکێکە لە بابەتە گرنگ و گەرمەکان، بابەتێکە کۆن نابێت و توێژینەوەی زۆری لەسەر کراوە، هەر کەس بەو جۆرەی کە پێی ڕاستە ئەسپی خۆی تێدا تاوداوە، بەڵام بەڕاستی گرنگە کە ئێمە دیراسەی بابەتێکی شەرعی دەکەین ڕەچاوی سەردەم و کۆمەڵگەی ئێستای مرۆڤایەتی و حاڵەتی مسوڵمانان لە جیهاندا بە گشتی و مسوڵمانانی وڵاتی خۆمان بەتایبەتتر بکەین، وە دەبێ ئەوە بزانین فیقهو فەتوا کاریگەرە بە باروودۆخی سیاسی و گۆڕانکارییەکان، لە زەمەنێکدا مسوڵمانان لە جەنگ و فتووحات دابوون و گیرۆدەی کێشەی ناوخۆیی بوون جیاوازە لە سەردەمێکی تر، سەردەمێک سنوورەکان بۆ هەموو دونیا واڵا بوون جیاوازە لە سەردەمێک کە وڵاتان هەموو سنووردار کراون، سەردەمێک دەسەڵاتدارێک و چەند وەزیر و قازییێک حوکمی وڵاتیان کردووە جیاوازە لە سەردەمێک دەسەڵاتەکان لێک جیاکراونەوە و سەڵاحیەتی سەرۆکیش دیاری کراوە و سنووردار کراوە، لەمڕۆدا لە ڕێی دەستوورەوە ماف و ئەرکەکان دیاری دەکرێن، مسوڵمانان پێویستە شەڕی خۆیان لەکاتی دانانی دەستووردا بکەن بۆئەوەی یاسایەک دەرنەچێت دژ بە نەگۆڕەکانی ئیسلام، وەک لە دەستوری حکوومەتی فیدراڵی عێراق و پرۆژە دەستوری هەریمی کوردستاندا ئەوە هاتووە، دەبێ ئاگامان لەو پەیماننامە و بەڵێنانە بێت کە ئێمە وەک دەوڵەت لە گەڵ دونیادا ئیمزامان کردووە _ مادام پێچەوانەی شەرع

نییه ـ بەداخەوە زۆر توێژینەوەی بەناو ئەکادیمی دەبینی دەڵێی لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسی دا نوسراوە! هیچ باس و خواسی ئەمڕۆی تێدا نییە، واتە هیچ بارووەدۆخی ئەمڕۆی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تێدا ڕەچاو نەکراوە، وا دەزانێ تاکە دەسەڵات و بڕیار بەدەست بۆ خۆیەتی و بەس، بەکەیفی خۆی فەتوای کوشتنی خەڵک دەردەکات لەسەر ئەوەی کە نزیکەی هەزار ساڵ پێش ئێستا گوتراوە، بەڵکو فەتوایەکە هەزار ساڵ زیاتریشە بۆ کۆمەڵگەیەکی تایبەت و بارووەدۆخێکی تایبەت دراوە، فەتوای وا هەیە دەڵێت: تەنیا مسوڵمان مافی ژیانی هەیە! خەڵکی کافر هەمووی لەبەردەم سێ هەڵبژاردە دایە، یان مسوڵمان بوون، یان سەرانە، یان شەڕ، ئەوە دەگشتێنێ بەسەر هەموو حاڵەتەکاندا! نازانێ ئەوە لەگەڵ کەسانێکدا وتراوە کە لە گەڵ مسوڵمانان لە جەنگدا بوون، ئەوەش ئەوپەری دادگەری و ئینسافە کە لەکاتی جەنگدا چەند دەرفەتێک لەبەرامبەر نەیارەکەت دا بکەیەوە جگە لە جەنگ.

بابەتی هەڵگەڕانەوە کە ئێستا دیراسە دەکرێت کاریگەرە بە فەتوا و نووسینەکانی پێشوو و پێشینان، وابەستە نییە بە خودی قورئان و سوننەت، ئەگەر پەنجا ئایەت بێنیەوە بۆ یەکێک لەو کەسانە، هەر گوێشی لێ نییە و کاری تێناکات مادام فەتوایەکی سەلەف لەبارەیەوە نەهاتووە، بەڵام یەک فەرموودەی چەندماناهەڵگر بێنی لەلای ئەو ئەوە دینە، چونکە بۆ خۆی حەزی لە توندیی و زەبر و زەنگە، _ هەڵبەتە بەس بە قسە نەوەک بەکردەوە _! لە کاتێکدا هەموو قورئان و هەموو سیرە و ژیانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) پێچەوانەی ئەوەیە، تەنیا چەند فەرموودەیەک بە عام یان بە موتڵەق هاتووە، بەڵام بە فەرمووده ڕاستەکان تایبەت و بەستراوە و بەیان کراوە، بەداخەوە ئەم فەتوایانە بوونە بەڵگەی باش بەدەست مولحیدەکانەوە کە دەڵێن:

دین بڕوای بە پێکەوە ژیان و هاوڵاتی و بوون و ئازادی بیروو باوەڕ و بیروورِا نییە.

لە کوردستانی خۆشەویست زۆربەی هەرە زۆری مامۆستایانی ئایینی و مامۆستایانی زانکۆ و ڕۆشنبیران و نوسەران هەمان قەناعەتیان هەیە کە ئێمە باسمان کردووە، بەڵام بەداخەوە خەریکە ئەو فکرە نامۆیە زاڵ دەبێ لە کوردستان بە هۆی بێدەنگی هەرە زۆری ئەم توێژانەی کە باسمان کردن.

لەوبارەوە کۆمەڵێک نوسینی جوان کراوە لەلایەن نوسەرانی کوردەوە لەوانە: مامۆستا زەڵمی رەحمەتی، م. عەلی باپیر، م. بەختیار نەجمەدین، م. ڕیناس، م. قانیع خورشید، و ... .

هیوام وایە ئەم جۆرە قەناعەتە برەو بسێنێ و کاری پێ بکرێت، وە چیتر ئەسیری زەمانی ڕابردوو نەبین بەڵکو سوودی لێوەر بگرین.

ئەگەر لەهەر شوێنێکدا هەڵەم کردبێ مەمنونم بۆم ڕاست بکەنەوە، دڵنیاشم کاری مرۆڤ لەهەڵە خاڵی نییە، ئەوەی کە من وتوومە داهێنراوی خۆم نییە، زانایانی هاوچەرخ ــ بێجگە لە ڕەوتی سەلەفی ــ زۆربەیان هەمان ڕایان هەیە، منیش زۆر قەناعەتم پێیەتی و بەرگرشی لێدەکەم بۆیە ئەم نووسینەم نووسینی.

لێرەوە زۆر سوپاسی مامۆستای زانا و دانا و گەنج و خۆشەویست (م. صلاح الدین أحمد) دەکەم، کە پێداچونەوەی ئەم پەرتووکەی لە ئەستۆ گرت، دەمزانی جەنابیان زۆر سەرقاڵن بە نووسین و توێژینەوە و دەوامی زانکۆ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا گەورەییان نواند و پێداچونەوەکەیان لە ئەستۆ گرت، منیش لەبەر ئەوەی متمانەی تەواوم بە بەڕێزیان هەیە، بویە پێم وت: دەستت واڵایە لە زیاد کردن و کەم کردن و ڕەخنە و

تێبینی، جەنابیشیان وێڕای هەڵەچن و ڕێنووس و پێداچوونەوە و هەندێ شتی زمانەوانی، هەندێ شتی باشیشیان زیاد کرد بۆ نووسینەکە، بۆیە ئەوە زیاتر دڵخۆشی کردم، دووبارە زۆر سوپاسی دەکەم و دەست خۆشی لێدەکەم و نزای بە خێری بۆ دەکەم.

لە کۆتایی پەرتووکەکەدا تەوەرەیەکمان زیاد کردووە بۆ ئەم پەرتووکە بە ناوی (مەقاسیدی قورئان) چونکە وا دەزانم ئەگەر لە مەقاسیدی قورئان تێبگەین زیاتر واقیعی دەبین و لە بیروبۆچوون و فەتوای ڕاست نزیکتر دەبینەوە.

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين،**

**وصلى وسلم على سيد الانبياء والمرسلين .**

# پێشەکی

صلاح الدين أحمد

هەڵگەڕانەوە لە دین بابەتێکی مشتومڕ لەسەری ناو زانایانی کۆن و تازەیە، بەڵام ئەم بابەتە ئەوەندەی بابەتێکی کەلامی عەقیدەیی فکری وە سیاسییە ئەوەندە بابەتێکی فیقهی و شەرعی نییە، چونکە بابەتەکە بە پلەی یەکەم پەیوەندی هەیە بە فکر و بیروباوەڕ و قەناعەت و بیرکردنەوە، کەسی هەڵگەڕاوە یەکەم قۆناغ لە فکرەوە دەست پێدەکات و ڕەنگە دواتر قۆناغەکانی تریش بگرێتەوە، چونکە هەڵگەڕانەوە، یەک جۆر نییە، هەڵگەڕانەوەی فکری و عەقیدەیی و کۆمەڵایەتی سیاسی و ... هەیە، مەرج نییە ئەوەی لەڕووی فکری و عەقیدەییەوە هەڵگەڕایەوە لەڕووی کۆمەڵایەتیش هەڵگەڕێتەوە و هەڵگەڕێتەوە لە کومەڵگە و دەوڵەت و سیستەم و خەڵک و دەستەڵات، کەواتە ئەم بابەتە دیوێکی فکری و دیوێکی کردەیی هەیە، بەڵام بەداخەوە زۆربەی زانایانی کۆن و نوێ ئەم دوو جۆرە هەڵگەڕانەوەیان لێک جیانەکردۆتەوە و هەموو هەڵگەڕانەوەیەکی فکریشییان بە هەڵگەڕانەوەی کردەیی لێکداتەوە، کە دیارە ئەمەش زۆر دوورە لە ڕووح و ناوەڕۆکی قورئان و سوننە و سیرەی پێغەمبەر (ﷺ) و مەقاسیدی شەریعە و یاسا گشتییەکانی ئیسلام، بەڵام حەتمەن ئەوانیش دووبارە لەبەر هۆکاری سیاسی و ... ئەمەیان هەڵبژاردووە، هەروەک دواتر باسی دەکەین.

تێگەیشتنی هەر بابەتێک پێویستە یەکەمجار لەژێر ڕۆشنایی قورئاندا بێت، قورئانیش نەک بەشێکی بەڵکو هەموو قورئان و یاسا گشتییەکان و ڕووحەکەی، ئینجا دەگەڕێنەوە بۆ سوننەت و فەرموودەکانی سەروەرمان

(ﷺ)، ئەمەشیان بەهەمان شێوە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ هەموو سوننە و فەرموودەکان، نەک تەنها ئەو فەرموودانەی لەگەڵ ڕای مندا دێنەوە، ئینجا سوننەتیش دەبێ لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سیرەی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) و کۆی گشتی فەرموودەکان و یاسا ئوسوڵییەکان و مەقاسیدی شەریعە و ڕووحی ئیسلام و یاسا گشتییەکانی ئیسلامدا ڕاڤە بکرێت، نەوەک لەژێر ڕۆشنایی سەردەمی ڕابردوو و باردۆخی تایبەتی ئەوکات و کاریگەری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەوکات یان تێگەیشنی چەند زانایەک.

خوای گەورە مرۆڤی بۆ تاقیکردنەوە درووست کردووە، ئەگەر مرۆڤ ئازاد نەبێت چۆن تاقیدەکرێتەوە؟! مرۆڤ چۆن دەتوانێت چاک و خراپ هەڵبژرێت ئەگەر توانای نەبێت و دەستبەسەر بێت؟! چۆن دەکرێ بابەتێکی ئاوا گرنگ قورئان باسی نەکات، لەکاتێکدا چەندین شتی زۆر لەوە ئەهوەنتر باس کراوە، باسی چوونە ماڵان کراوە، باسی لەچک و سەرپۆش کراوە، باسی درۆ و بوهتان و دزی و... کراوە، لەکاتێکدا کوشتنی هەڵگەڕاوە لە هەموو ئەم بابەتانە گەورەترە؟!. بیروباوەڕ بە دڵ قبوڵ دەکرێت، چۆن دەکرێت بە تۆبزی تۆبە بە کەسێک بکەیی و بیکەیە مسوڵمان!؟ ئەگەر کەسێک بە درۆ مسوڵمان بێت دەبێتە (منافق) دووڕوو، ئایا کامەیان ئەهوەنتر و کەم زیانترە؟ ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین دەبینین جەخت لەسەر چەند خاڵێک دەکاتەوە لەم بارەیەوە: هەموو کەسێک ئازادی بیروباوەڕی هەیە و چ بیروباوەڕێک هەڵدەبژێریت ئازادە. تۆبزی و زۆر لە کەس ناکرێت. هەر سزایەک هەبێت بۆ هەڵگەڕاوەی ئاشتی خواز یان بێباوەڕی ئەسڵی لە قیامەتدایە نەک لە دونیا، بۆیە ئەگەر لە ئایەتەکان وردبینەوە سزای دونیایی بۆ دانەناون و لە هەموویاندا دەفەرموێت: لە قیامەتدا سزا دەدرێن. ئاشتی ئەسڵە و هەتا هێرش نەکرێت هێرش نابرێت، هەتا شەڕ نەخوازرێت

شەڕ ناکرێت، هەتا ئاشتی هەڵبژێرن ئاشتییان لەگەڵدا دەکرێت و پێکەوە ژیانیان لەگەڵدا جێبەجێ دەکرێت.

وەک زانایان و توێژەران دەفەرموون: پێویستە زۆر بە وردی جیاکاری بکەین لە نێوان ئەم دوو دەستەواژەیە: (مرتد ومتمرد) واتە: هەڵگەڕاوە لەگەڵ سەرکەش (یاخی)، وە (خارج عن الاسلام والخارج على الاسلام) واتە: دەرچوون لە ئیسلام لەگەڵ دەرچوون لە دژی ئیسلام و موسڵمانان و جەنگان لە گەڵیاندا.

هەڵگەڕاوە بە پێی دەقەکانی ئایەت و فەرموودە کێشە دروست ناکات بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، واتە: ئەوەی پێی دەوترێت: مورتەد یان دەرچوو لە ئیسلام، بەڵکو ئەو کەسەی یاخی دەبێت و ئاشووب و ئاژاوە دەنێتەوە و پلانگێڕی دەکات و چەتە و ڕێگری دەکات و بەناهەق کودەتا بەسەر مسوڵماناندا دەکات، ئەو جۆرەیان بەپێی تاوانەکەی سزا دەدرێت.

بەکورتی بابەتەکە پەیوەندی هەیە بە خیانەت و دەرچوون لە دەوڵەت و کۆمەڵگە و خەڵک نەوەک دەرچوون لە ئایین، چونکە بە دەرچوونی لە ئایین بەبێ خیانەت و ئاشوب و شەڕ و گێرەشێوێنی هیچ زیانێک لە کەس نادات، بەڵام بە دەرچوونی لە دەوڵەت و کۆمەڵگە و خەڵک و ئاژاوە و ئاشوب و کودەتا و گێرەشێوێنی و مافیاگەری زیان بە هەموان دەگەیەنێت، کەواتە مەبەستەکە خیانەت و زیانگەیاتدن و تێکدانی کۆمەڵگە و گێرەشێوێنی و ئاشووبە مافیاگەرییە نە شتی تر.

سیرەی جوانی سەروەرمان (ﷺ) پڕە لە بەخشینی ئازادی، سەروەرمان دەستەڵاتی تەواوی هەبوو بەڵام هەڵگەڕاوەی ئاشتیخوازی هەرگیز نەکوشتووە.

مەقاسیدی شەریعە و یاسا گشتییەکانی ئیسلام دژی ئەوەن، چونکە کوشتنی هەڵگەڕاوەی ئاشتیخواز هیچ سوودێکی نییە غەیری زەرەر و زیان.

ڕەنگە بشوترێت: بۆچی زانایان ئاوا یەک دەنگ دەردەکەون لەسەر کوشتنی هەڵگەڕاوە؟ زانایان لەبەر ئەم هۆکارانە ئاوا دەردەکەون: نەگەڕانەوە بۆ کۆی گشتی فەرموودەکان و قورئان و سیرەی پێغەمبەر (ﷺ) و یاسا ئوسوڵییەکان، واتە نەخوێندنەوەی گشت بابەتەکە بەیەکەوە. وە هەروەها بۆ ڕێگری کردن لە لەبەریەک هەڵوەشانی کۆمەڵگەی موسڵمانان و دزەکردنی ناموسڵمانان بۆ ناو ئیسلام و موسڵمانان بە ناڕاستگۆیی و دوایی هەڵگەڕانەوەیان و لە دژ وەستانی موسڵمانان، چونکە موسڵمانان سەردەمانێکی زۆر لە ململانێدا بوون بەرامبەر شارستانییەکانی تردا، کەواتە لەم ڕووەوە زانایانیش عوزری خۆیانیان هەبووە، کە ئەم دەرگایەیان لەم سەردەمانەدا نەکردۆتەوە بە ڕووی نەیاراندا تاوەکو بە فێڵ و موئامەرە دزە بکەنە ناو موسڵمانەوە و حوکمەکەیان زۆر قورس کردووە، دەشکرێ بەشێکیشی بگەڕێتەوە بۆ تەفسیری هەڵە و جەمع نەکردنی دەقەکان و ...، وە هەندێ جاریش ویست و حەزی دەسەڵاتی سیاسی لەپشت بووە، بۆ سەرکووت کردنی نەیارەکانیان بە بیانووی هەڵگەڕانەوە لە دین یان لە دەسەڵاتی سیاسی، چونکە حوکمی کوشتنی هەڵگەڕاوە بەدرێژایی مێژوو دەرگایەکی زۆر مەترسیداری بەسەر دەستەڵادران کردۆتەوە و بەهۆیەوە چەندان زانای گەورە و کەسایەتییان بە هەڵگەڕاوە لەقەڵەم داوە و کوشتوونیان! بۆیە ئەگەر بەهەستیارییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتەدا نەکرێت کارەسات دەخولقێنێت، وەک بیینیمان سەددام حوسێن چۆن ئەم بابەتەی بەکارهێناو کوردی بە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام لەقەڵەمدا و پاشان بە ناوی ئەنفال و کوشتنی هەڵگەڕاوە کوردی قڕ کردا! ئینجا مەترسیی ئەم بابەتە لەوەدایە کە پەیوەندی هەیە بە بابەتەکانی ترەوە، بۆنموونە: ئیمان

چییە؟ کوفر چییە؟ هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان ئیسلام چیین؟ ....؟ کەواتە ئەگەر ئەم دەرگای کوشتنی هەڵگەڕاوەی ئاشتیخواز بکرێتەوە، دەبێ نیوەی زیاتری ئوممەت بکوژرێت، چونکە بەپێوەری هەندێ قوتابخانە و گروپی عەقیدەیی و فکری زۆر شتی سادە و ساکار کوفرن، کە کەسەکەش کوفری کرد ـ بەپێی بۆچوونی ئەم ـ کەواتە هەڵگەڕاوەتەوە، کە هەڵگەڕایەوە کەواتە دەبێ بکوژرێت! کەواتە گێژاوێک درووست دەبێت ئەوسەری دیار نییە ...، بەڵام وەک وتمان ئەم بابەتە چونکە پەیوەندی هەیە بە سیاسەی شەرعی، کەواتە دەبێ بەشێکی گەورەی لێ گەڕێین بۆ سەرکردە ڕاستەقینە دادگەرە حەکیمە ئیسلام دۆستەکان، هەرکاتێ دەستەڵاتێکی دادگەری حەکیمی موسڵمان هەبوو، ئەوکات بە ڕاوێژ لەگەڵ زانایان و توێژەران و موجتەهیدان و ... ئەم حوکمە سیاسییە گشتییانە یەکلادەکرێنەوە، لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننە و سیرە و مەقاسیدی شەریعە و واقیع و بارودۆخ و بەرژەوەندی کۆی گشتی موسڵمانان و ئوممەت و خاک و وڵات.

بەهەموو پێوەرێک قورئان لەگەڵ ئازادیدایە و دژی کوشتن و تۆبزی لێکردنە، بۆیە تاکە ئایەتێکت دەستناکەوێت کە بفەرموێت: هەڵگەڕاوە بکوژن، وە چەندان فەرموودە بە تایبەتکراوی (مخصَّص) هاتوون و بە ڕاشکاوی وتوویانە تەنیا ئەوانە دەکوژرێن کە شەڕکەر و ئاژاوەگێڕ و خیانەتکارن، وە هەروەها سیرەی جوانی سەروەرمان (ﷺ) شایەتی ئەو ڕاستییە دەدات، چونکە سەروەرمان (ﷺ) دەستەڵاتی تەواوی هەبوو، بەڵام هەڵگەڕاوەی ئاشیخوازی هەرگیز نەکوشتووە، وە مەقاسیدی و شەریعە و یاسا گشتییەکانی ئیسلامیش دژی ئەوەن، چونکە کوشتنی هەڵگەڕاوەی ئاشیخواز هیچ سوودێکی نییە غەیری زەرەر و زیان و دەرگا والاکردن بەسەر کەسانێک کە بەکەیفی خۆیان بەکاری بێنن.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەمە بەمانای ئەوە نییە دەرگا بخرێتە سەر پشت و خەڵک هانبدرێت و هەرکەس ڕاستبۆوە بێت سوکایەتی بە ئیسلام و موسڵمانان و پیرۆزی ئەو هەموو خەڵکە بکات، نەخێر، ئەوکات ئەگەر دەستەڵاتێکی ڕاستگۆ هەبێت هەموو ئەمانە بە یاسا ڕێکدەخرێن و ئەم کێشەیەش ڕووبەڕوومان نابێتەوە.

لەکۆتاییدا زۆر دەستخۆشیم هەیە بۆ مامۆستای گەورە و دانا و زانا جەنابی م. حەسەن عەلی بۆسکێنی، کە هەستا بە نووسینی ئەم توێژینەوە و پەرتووکە جوان و پێویست و واقعییە، کە بەڕاستی زۆر جوان بۆ بابەتەکان چووە و هەموو هەوڵەکەشی بۆ بەرگری کردن بووە لە خودای گەورە و قورئان و پێغەمبەر (ﷺ) و ئیسلام و موسڵمانان و ڕەواندنەوەی گومان و پرسیار لەبارەی ئەم پرسەوە و وەڵامی دوژمنان و مولحیدان کە ئیسلام تۆمەتبار دەکەن بە دژە ئازادی و زەبروزەنگ و توندڕەوی و .....، مامۆستا نموونەی زانای قوڵ تێگەیشتوو و واقیعی و مەقاسیدییە و هەردەم هەوڵدەدات بۆ ڕاڤەکردنی قورئان و سوننە بەشێوەیەکی جوان و واقیعی و مەقاسیدی و دووربوون لە شلڕوەیی و توندڕەوی، خوای گەورە زیاتر سەرکەوتوو و سەرفرازی بکات و موسڵمانانیش زیاتر لە فکر و بیروبۆچونە جوانەکانی بەهرەمەند بکات.

## مامەڵەی دروست لەگەڵ کەلەپور وتوراسی زانایان و جیاوازییەکاندا

لێرەوە بەپێویستی دەزانم هەندێ یاسا و بنەمای گشتی بخەمەڕوو بۆ مامەڵەی درووست لەگەڵ جیاڕایی و ئیختیلاف و زانایان و توراس و کەلەپوور و جیاوازییەکاندا :

١- الْحَذَرُ مِنَ الْإِكْثَارِ فِي الرُّدُودِ : ئاگاداربوون و دووربوون لە ڕەددانەوە و وەڵامدانەوەی زۆر و لەڕادەبەدەر

٢- عَدَمُ النَّقْدِ الغَيْرِ الْمُنْصِفِ : ڕەخنەنەگرتنی نابەجێ و بێ ئینسافانە

٣- الْعَدْلُ حَتَّى مَعَ الْأَعْدَاءِ وَالْمُخَالِفِينَ : دادگەری هەتا لەگەڵ دوژمنان و موخالفەکانیشدا

٤- مُرَاعَاةُ النَّتَائِجِ فِي الْأَقْوَالِ وَالْأَفْعَالِ وَالْمَوَاقِفِ وَالْفَتَاوَى وَالْاِجْتِهَادَاتِ ( مُرَاعَاةُ فِقْهِ الْمَآلَاتِ) : ڕەچاوکردنی سەرەنجامی گوفتار و ڕەفتار و هەڵوێست و فەتوا و ئیجتیهادەکان

٥- الْاِعْتِقَادُ بِأَنَّ الْمَعْصِيَةَ وَالْخَطِيئَةَ وَالْكَبِيرَةَ لَا تُخْرِجُ صَاحِبَهَا مِنَ الدِّينِ وَلَا يَقْطَعُ الْمُوَالَاةَ مَا لَمْ يَسْتَحِلَّهَا : باوەڕبوون بەوەی کە گوناهو تاوان و هەڵە و گوناهی گەورە خاوەنەکەی لە ئایین دەرناکات و دۆستایەتیش ناپچڕێنێت مادام بە حەڵاڵی نەزانێت

٦- الْاِنْتِفَاعُ مِنَ الْمُخَالِفِ وَالْأَعْدَاءِ : سوود بینین لە موخالیف و دوژمنان

٧- قَصْدُ هِدَايَةِ الْمُخَالِفِ عِنْدَ الْاِخْتِلَافِ : لەکاتی جیاوازی و ڕاجیاییدا لەگەڵ جیاواز و موخالیفەکاندا مەبەستت هیدایەتدانیان بێت نەوەک شتی تر

٨- عَدَمُ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ الْمُخَالِفِينَ، وَهُمْ فِي مَنَازِلٍ مُتَفَاوِتَةٍ : یەکسانی نەکردن لەنێوان موخالیفەکاندا، چونکە ئەمانیش جۆر و پلە و ئاستی جۆراوجۆریان هەیە

٩- الصَّبْرُ عَلَى أَذَى الْمُخَالِفِينَ : ئارامگرتن لەسەر ئەزیەت و ناڕەحەتییەکانی موخالیفەکان

١٠- الْمُحَافَظَةُ عَلَى السَّكِينَةِ الْاِجْتِمَاعِيَّةِ وَأَمْنِهَا عِنْدَ الْاِخْتِلَافِ : پارێزگاری کردن لە ئارامی و ئاشتی کۆمەڵایەتی لە کاتی جیاوازییەکاندا

١١- نُصْرَةُ الْمُخَالِفِينَ عِنْدَ الْبَغِيِّ عَلَيْهِمْ وَالظُّلْمِ : سەرخستنی موخالیفەکان لەکاتی دەستدرێژی کردنە سەریان و ستەم لێکردنیان

١٢- عَدَمُ تَسْمِيَةِ الْمُخَالِفِينَ بِمَا لَا يُحِبُّونَهُ وَلَا يَرْضُونَ بِهِ وَلَا يَنْطَبِقُ عَلَيْهِمْ: ناونەنانی موخالیفەکان بە ناوێک کە پێیان خۆش نییە و پێی ڕازی نین یان هەر لەسەریان جێبەجێ نابێت

١٣- الْوَسَطِيَّةُ وَعَدَمُ الْعُنْفِ وَالتَّطَرُّفِ : میانڕەوی و ناوەندگیری و دووربوون لە توندوتیژی و پەڕگیری (تەڕەفگیری)

١٤- التَّوَازُنُ بَيْنَ ثَوَابِتِ الشَّرعِ وَمُتَغَيِّرَاتِ الْعَصْرِ : هاوسەنگی ڕاگرتن لە نێوان نەگۆڕەکانی شەریعەت و گۆڕاوەکانی سەردەم

١٥- التَّوَازُنُ بَيْنَ كَسْبِ الْقُلُوبِ وَكَسْرِ الْقُلُوبِ : هاوسەنگ بوون لە نێوان دڵ ڕاکێشان و دڵ شکاندندا

١٦- التَّوْحِيدُ وَالْاِبْتِعَادُ عَنِ الشِّرْكِ : یەکتاپەرستی و دوورکەتنەوە لە شیرك و هاوبەش دانان بۆ خودا

١٧- التَّجْدِيدُ فِي الْفِكْرِ وَالْفِقْهِ وَالدَّعْوَةِ وَالتَّفْسِيرِ لِلْقُرْآنِ وَالسَّنَةِ وَالْعُلُومِ الشَّرْعِيَّةِ كُلِّهَا : نوێگەری لە هزر و فیقە و بانگەواز و تەفسیر و ڕاڤەی قورئان و سوننە و هەموو زانستە شەرعییەکان

١٨- عَدَمُ التَّصَرُّفِ الْمَصْلَحِيِّ مَعَ النُّصُوصِ : مامەڵە نەکردن لەگەڵ دەقدا بە مامەڵەکردنێکی بەرژەوەندی خوازانە

١٩- الْاِتِّزَانُ وَالْوَاقِعِيَّةُ فِي الْفَتْوَى مَعَ مُرَاعَاةِ الزَّمَانِ وَالْمَكَانِ وَمُسْتَجَدَّاتِ الْعَصْرِ : هاوسەنگی و واقیعی بوون لە فەتوادا لەگەڵ ڕەچاوکردنی کات و شوێن و شتە نوێکانی سەردەم

٢٠- تَجْدِيدُ التُّرَاثِ بَدَلَ تَمْجِيدِهِ وَتَجْمِيدِهِ : نوێگەری لە توراس و کەلەپوردا لەبری چەقبەستوویی و بە پیرۆزدانان

٢١- صُدُوْرُ الْفَتْوَى مِنْ أَهْلِهِ : دەرچوون و دەرکردنی فەتوا لەلایەن ئەهلی خۆی و خەڵکی شایستە

٢٢- عَدَمُ مُحَاوَلَةِ رَفْعِ الْخِلَافِ فِي الْفُرُوعِ : هەوڵنەدان بۆ لابردنی جیاوازی و ڕاجیایی لەشتە فەرعی و جوزئییەکاندا

٢٣- عَدَمُ الْإِنْكَارِ عَلَى الْمُخَالِفِ فِي الْمَسَائِلِ الْخِلَافِيَّةِ : ئینکاری نەکردن و نکۆڵی و دژایەتی نەکردنی ئەوانەی هاوڕا نین لەگەڵتدا لەو بابەتانەی جیاوازی و ڕاجیایی هەڵدەگرن

٢٤- عَدَمُ تَنْزِيلِ فَهْمِ الْإِنْسَانِ مَنْزِلَةَ الشَّرَعِ وَإِلْزَامُ النَّاسِ بِهِ : نەکردن و دانەنانی بۆچوون و تێگەیشتنی مرۆڤ بە شەرع و پەیوەست نەکردن و پابەندنەکردن و نەبەستنەوەی خەڵکی پێیانەوە

٢٥- عَدَمُ صِبْغِ الْمَسَائِلِ الدِّينِيَّةِ بِطَبِيعَةٍ بَشَرِيَّةٍ وَالطَّبِيعَةُ الْبَشَرِيَّةِ بِصِبْغَةٍ دِينِيَّةٍ : ڕەنگنەکردن و بەرگی ئایینی نەکردنە بەری خوو و سروشتە ئادەمییەکان و بە پێچەوانەشەوە نەکردنی مۆرك و سروشتە ئادەمییەکان بە دین و ڕەنگ و بەرگی ئایینی کردنە بەریان

٢٦- مُرَاعَاةُ الْبِيئَاتِ وَالْأَحْوالِ فِي بِنَاءِ الْأَحْكَامِ وَالْمَوَاقِفِ : ڕەچاوکردنی ژینگە و حاڵ و بارودۆخەکان لەکاتی بڕیاردان و حوکمدان و مامەڵە کردن و هەڵوێست وەرگرتندا

٢٧- الْاِعْتِدالُ فِي التَّقْلِيدِ وَالتَّمَذْهُبِ بَيْنَ الْإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطَ : تێڕوانین و مامەڵەیەکی دروست و هاوسەنگ لەگەڵ (تەقلید) و (مەزهەبی) بوون لە نێوان زیادەڕەوی و کەم ڕەویدا

٢٨- الْاِعْتِقَادُ بِأَنَّ الْمُخْطِئَ فِي الْاِجْتِهَادِ - مَادَامَ مِنْ أَهْلِهِ - مَعْذُورٌ وَمَأْجُورٌ : باوەڕبوون بەوەی کە ئەگەر موجتەهیدێك (زانایێک) هەڵەی کرد لە ئیجتیهاد و ڕەئیەکەی – بەو مەرجەی شیاو و شایستە و پیاوی ئەو مەیدانە بێ - پاداشت وەردەگرێت و دەبێ عوزری بۆ بهێنرێتەوە

٢٩- عَدَمُ تَأْدِيَةِ الْخِلَافِ الْفِقْهِيِّ وَالْفُرُوعِ الْعَقَدِيَّةِ إِلَى التَّفْرِقَةِ وَالْبُغْضِ وَالْعَدَاوَةِ : سەرنەکێشانی جیاوازی - خیلافی فقهی - هەروەها بابەتگەلێکی ناسەرەکی عەقیدەیی بۆ پارچە پارچە بوون و پەرتەوازەیی و ڕق و قینە و دابڕان و دوژمنایەتی و لێکخوێنندن

٣٠- إِرْجَاعُ الْأَقْوَالِ وَالْأَفْعَالِ وَالْمَوَاقِفِ ( الْفَتَاوَى، الْاِجْتِهَادَاتِ، الْآرَاءِ ) إِلَى زَمَانِهَا وَمَكَانِهَا وَوَاقِعِهَا، وَفَهْمُهَا فِيهَا : ڕەچاوکردن و گێڕانەوەی قسە و کار و هەڵوێست (فەتوا، ئیجتیهاد، ڕاو و بۆچوون) بۆ ئەو سەردەم و شوێن و بارودۆخەی کە تێیدا گوتراوە و کراوە، هاوکات لەگەڵ ئەوانەدا تێگەیشتنیان لە ژێر ڕۆشنایی ڕەچاوکردنی ئەمانەدا

٣١- التَّوَسُّطُ بَيْنَ الْإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ فِي فَهْمِ الْبِدْعَةِ : هەڵوێستی ناوەندگیر و ئەمپەر و ئەو پەڕ نەگیری دەربارەی بیدعە

٣٢- الْاِعْتِقَادُ بِأَنَّ الْأَحْكَامَ وَالْفَتَاوَى تَتَغَيَّرُ بِتَغَيُّرِ الزَّمانِ وَالْمَكَانِ وَالْعُرْفِ وَمُسْتَجَدَّاتِ الْعَصْرِ : بڕوابوون بە گۆڕانی فەتوا و حوکمی شەرعی - لە شتە گۆڕاوەکان - بە گوێرەی شوێن و کات و سەردەم و داب و نەریت و شتە نوێکانی سەردەم

٣٣- الْاِعْتِقَادُ بِأَنَّ الْاِخْتِلَافَ فِي الْفِقْهِ وَفُرُوعِ الْعَقِيدَةِ طَبِيعِيٌّ وَوَاقِعٌ : بڕوابوون بە تێڕوانینی جیاواز لە فیقە و بوارە لاوەکی و ناسەرەکییەکانی عەقیدە

٣٤- عَدَمُ الْاِعْتِقَادِ بِأَنَّ الْخَطَأَ فِي التَّأْوِيلِ وَالْاِجْتِهَادِ يُخْرِجُ صَاحِبَهُ مِنَ الدِّينِ، وَيَقْطَعُ الْمُوالاةَ أَوْ يَنْقُصُهَا : بڕوانەبوون بە دەرچوون لە دین بەهۆی تەئویل و ئیجتیهادی هەڵەوە، وە پچڕاندن یان کەم کردنەوەی پەیوەندی و دۆستایەتی و لەگەڵ یەکبوون بەم هۆیەوە

٣٥- عَدَمُ اِدِّعَاءِ الْعُلَمَاءِ بِأَنَّ الصَّوَابَ مَعَهُمْ فِي جَمِيعِ اِجْتِهَادَاتِهِمْ ( صَرَاحَةً أَوْ دَلَالَةً ) : بانگەشەنەکردنی زانایان و کەسانی شارەزا بەوەی کە ڕاستی تەنها و تەنها لەلای ئەوانە و بەس ئەوان ڕاست و حەقن، جا ئەم بانگەشەیە یان بە ڕاشکاوی دەکرێت یان بە ناڕاشکاوی

٣٦- تَقْيِيمُ التُّرَاثِ بِمِيزَانِ الْقُرْآنِ وَالسُّنَّةِ الصَّحِيحَةِ وَمَقَاصِدِ الشَّرِيعَةِ : هەڵسەنگاندن و بەهێزکردنی توراس و کەلەپور و میراتی زانایان بە قورئان و سوننە و مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعة)

٣٧- الْاِعْتِدالُ فِي تَقْيِيمِ الْعُلَمَاءِ وَالْمَذَاهِبِ وَالتُّرَاثِ وَالْأَفْكَارِ وَالْآرَاءِ : دادپەروەری و ئینساف لە هەڵسەنگاندنی زانایان و ڕێڕەو و مەزهەبەکان و توراس و ئەفکارەکان و بیر و ڕاکان

٣٨- عَدَمُ الْاِعْتِقادِ بِأَنَّ نَقْدَ الْآرَاءِ يَعْنِي الطَّعْنَ فِي أَصحَابِهَا : باوەڕنەبوون بەوەی کە ڕەخنەگرتن لە بیر و ڕای کەسانێك یەکسانە بە تانە و تەشەردان لە خاوەنەکانیان

٣٩- تَجَنُّبُ الصِّيَاغَةِ الْاِعْتِقادِيَّةِ لِلْخِلَافَاتِ الْفَرْعِيَّةِ : دوورکەوتنەوە لە بە عەقیدەیی کردنی جیاوازییە لاوەکییەکان

٤٠- عَدَمُ الْإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ فِي التَّأْوِيلِ وَالتَّفْرِيقُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ التَّحْرِيفِ : زیادەڕەوەی نەکردن و کەمڕەوی نەکردن لە تەئویل کردندا، وە جیاوازی کردن لە نێوان تەئویل و تەحریف و شێواندندا

٤١- عَدَمُ إِثارَةِ الْخِلَافِ الْمَوْجُودِ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ وَالدُّعَاةِ وَالْجَمَاعَاتِ عِنْدَ عَوَامِّ النَّاسِ : نەوروژاندنی جیاوازی نێوان زانایان و بانگخوازان و گروپەکان و کۆمەڵەکان لە لای خەڵکی عەوام

٤٢- عَدَمُ الْجُمُودِ الْفِقْهِيِّ وَالْفِكْرِيِّ : ڕانەوەستاوی و سستی نەکردن لە بەرەو پێشچوونی فیقهی و فیکریدا

٤٣- الرُّجُوعُ إِلَى الْحَقِّ (بَعْدَ ظُهُورِهِ) : گەڕانەوە بۆ حەق و ڕاستی لەدوای ئەوەی بۆی ڕوونبۆوە

٤٤- عَدَمُ حَمْلِ كَلَامِ الْمُخَالِفِ عَلَى أَسْوَئِهِ وَأَقْبَحِهِ : لێکنەدانەوە و شرۆڤەنەکردنی قسەی ئەوانەی هاوڕانین لەگەڵت بە ناشیرینترین و بێزراوترین شێواز

٤٥- تَجْرِيدُ الدَّعْوَةِ مِنَ التَّعَصُّبِ الْحِزْبِيِّ وَالشَّخْصِيِّ وَالطَّائِفِيِّ وَ ... : بەدوور گرتن و داماڵین و - خاڵی کردنەوەی - بانگەواز و کاری ئیسلامی لە دیاردەی دەمارگیری مەزهەبی و پێڕگەرایی تائیفی و بە کەسێتی کردنی کارەکان

٤٦- عَدَمُ تَصْحِيحِ الآخَرِينَ أَوْ نِصْحِهِمْ فِي الْعَلَنِ: ئامۆژگاری نەکردن و ڕاست نەکردنەوەی کەسی بەهەڵەداچوو و تاوانبار بە بەرچاوی خەڵکەوە و بە ئاشکرا

٤٧- عَدَمُ الْمُنَاقَشَاتِ وَالْحِوَارَاتِ فِي الْعَلَنِ : گفتوگۆ نەکردن لەبەر چاوی خەڵک و بە ئاشکرا

٤٨- اتِّخَاذُ الْحِوَارِ وَسِيلَةً لِلْوُصُولِ إِلَى الْحَقِّ وَالْحَقِيقَةِ : بەکارهێنانی گفتوگۆ وەك هۆکار و ڕێگاییێك بۆ گەیشتن بە ڕاستی و حەقیقەت

٤٩- عَدَمُ رَفضِ إمْكَانِ تَعَدُّدِ الصَّوَابِ : باوەڕبوون بە چەندایەتی دەرئەنجامی جۆراوجۆر و دروست و پێکانی چەند لایەنە و زیاد لە ڕوییێك و ڕەت نەکرنەوە و وەلانەنانی

٥٠- عَدَمُ الِادِّعَاءِ بِأَنَّ الْمُخَالِفَ مُخْطِئٌ دَوْمًا (صَرَاحَةً أَوْ دَلَالَةً) : بانگەشەنەکردن و بڵاونەکردنەوەی دەنگۆی ئەوەی کە کەسی بەرامبەر - ئەوانەی کە خاوەنی ڕای جیاوازن - هەمیشە لە هەڵەدان و بە هەڵەدا چوون و لایانداوە

٥١- التَّمْيِيزُ بِيْنَ الْخَطَأ وَالْخَطِيئَةِ وَبَيْنَ الْقُصُورِ وَالتَّقْصِيرِ : جیاوازی کردن و لێککردنەوەی نێوان هەڵەیەك کە بە نەزانی دەکرێ لەگەڵ هەڵەیەك کە بە زانین و ئاگاییەوە دەکرێت، یان لە نێوان نەبوونی توانا و دەستەوەستانی لەگەڵ کەمتەرخەمی و گوێ پێنەدانی

٥٢- عَدَمُ الِاشْتِغَالِ فِيمَا لَا يُدْرَكُ بِالْوَحْيِ وَالْعَقْلِ وَالْعِلْمِ وَالْحَوَاسِّ : خۆسەرقاڵ نەکردن بەو بابەتانەی کە نە لە ڕێی وەحی نە عەقڵ و نە زانست ونە هەستەکان پەیان پێ نابرێ

٥٣- عَدَمُ إِثَارَةِ الْمَسَائِلِ الْعَقَدِيَّةِ وَالْفِكْرِيَّةِ وَالْفِقْهِيَّةِ الْمُخْتَلَفِ فِيهَا بَيْنَ عَوَامِّ النَّاسِ: نەوروژاندنی بابەتگەلێکی عەقیدەیی و بیر و باوەڕ و فیکری و فیقهی لەناو خەڵکی سادە و ڕەشۆکی -عەوام - کە زانایان تێیاندا کۆڕا نین و جیاوازن

٥٤- عَدَمُ الِاهْتِمَامِ بِالْجُزْئِيَّاتِ عَلَى حِسَابِ الْكُلِّيَاتِ : گرینگی نەدان بە بابەتە - شتە - لاوەکییەکان لەسەر حسابی بابەتە گشتی و سەرەکییەکان

٥٥- عَدَمُ الْمُجَادَلَةِ وَالْبَحْثِ فِي مُفَاضَلَةِ الْعُلَمَاءِ بَعْضِهِمْ عَلَى بَعْضٍ : دمبەدمە و شەڕە قسە نەکردن لەسەر ئەو زانا و ئەم زانا و باونەدان و بە بەرزتر دانەنانی هەندێکیان بە سەر هەندێکی تریاندا

٥٦- عَدَمُ الِاشْتِغَالِ وَالْخَوْضِ فِي الْمَسَائِلِ الَّتِي لَا يُبْنَى عَلَيْهَا عَمَلٌ: سەرقاڵ نەبوون و ڕۆنەچوون و نەچوونە ناو کۆمەڵە بابەتێك کە کردەیی نین و کاریان لەسەر بنیات نانرێت و هیچ سوودێکیان نییە نە بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی نە بۆ ژیان و نە بۆ ئیسلام

٥٧- التَّعَاوُنُ فِي الْمُتَّفَقِ عَلَيْهِ وَالتَّسَامُحُ وَالْاِحْتِرَامُ فِي الْمُخْتَلَفِ فِيه ِ: هەبوونی گیانی هاوکاری و دەستبار بۆ یەکگرتن لەسەر ئەو کارانەی کە کۆك و هاوڕاین تێیاندا هاوکات لەگەڵ ئەوەدا چاوپۆشی کردن و ڕێزدانان بەرامبەر بە یەکتری لەو شتانەی کە تێیاندا جیاوازین و بۆچونی جیاواز هەڵدەگرن

٥٨- الْجَمْعُ بَيْنَ الْقَدِيمِ وَالْجَدِيدِ وَعَدَمُ الْإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ فِي التَّمَسُّكِ بِهِمَا وَالِاهْتِمَامُ بِهِمَا: کۆکردنەوەی کۆن و تازە بەیەکەوە و زیادەڕەوی و کەم ڕەوی نەکردن لە دەست پێوە گرتن و گرینگی پێدانیان

٥٩- عَدَمُ إلْزَامِ النَّاسِ بِشَخْصٍ أَوْ مَذْهَبٍ أَوْ رَأْيٍ أَوْ فِكْرٍ أَوْ حِزْبٍ أَوْ جَمَاعَةٍ (عَلَى الْإِطْلَاقِ): پەیوەست نەکردنی خەڵکی بە کەسێک یان مەزهەب و ڕێباز و ڕاوبۆچونێک یان فیکر و حیزب و کۆمەڵ و پێڕ و تاقمێک بە ڕەهایی

٦٠- عَدَمُ الْحُكْمِ عَلَى الْمُقَابِلِ وَالْمُخَالِفِ قَبْلَ الاِسْتِقْرَاءِ وَالتَّيَقُّن: حوکم نەدان و بڕیاڕ نەدان لەسەر هیچ کەسێک هەتاوەکو بەدواداچونێکی تەواو و ورد و قوڵی بۆ دەکرێت

٦١- عَدَمُ انْتِهَاكِ حُرُمَاتِ الْآخَرِينَ : نەشکاندنی شکۆ و سنووری ئەوانی تر

٦٢- عَدَمُ تَنْقِيصِ الْآخَرِينَ وَ تَأْثِيمِهِم : کەمنەکردنەوەی ئەوانی تر و تاوانبار

٦٣- اِحْتِرَامُ الْعُلَمَاءِ وَأَقْوَالِهِمْ بَدَلَ تَقْدِيسِهِمْ أَوَ تَبْخِيسِهِمْ : ڕێزگرتن لە زانایان و ڕاو بۆچونەکانیان لەبری بە سووک سەیرکردنیان یان پیرۆزکردنیان

٦٤- الصَّدَاقَةُ وَالْمَحَبَّةُ وَالوِئَامُ وَالِاتِّحَادُ: هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و ئاشتی و ئاشتەوایی و یەکگرتوویی

٦٥- الْإِنْصَافُ وَالتَّسَامُحُ بَدَلَ التَّعَصُّبِ : ئینساف و لێبوردەیی لەبری دەماگیری

٦٦- التَّعَامُلُ مَعَ الْقَوْلِ بَدَلَ الْقَائِلِ : مامەڵەکردن لەگەڵ قسە و وتە نەوەک قسەکەر

٦٧- التَّعَمُّقُ وَالدِّقَّةُ فِي فَهْمِ الْإِسْلَامِ بَدَلَ السَّطْحِيَّةِ وَالظَّاهِرِيَّةِ: قوڵی و وردبینی لە تێگەیشتنی ئیسلام لەبری ڕووکەشی بوون و زاهیری بوون

٦٨- الْاِبْتِعَادُ عَنِ الْعَدَاوَةِ وَالْخِصَامِ وَالتَّفَرُّقِ : دووربوون لە دوژمنایەتی و دووبەرەکی و کێشمەکێش و پەرتەوازەیی

٦٩- الْاِنْتِمَاءُ لِلْمَنَاهِجِ بَدَلَ الْأَشْخَاصِ: ئینتیمابوون بۆ مەنهەج و بەرنامە لەبری ئینتیمابوون بۆ شەخس

٧٠- التَّرْكِيزُ عَلَى الْمُتَّفَقِ عَلَيْهِ : تیشک خستنەسەر ئەو بابەتانەی (شتانەی) کۆدەنگییان لەسەرە

٧١- الْاِبْتِعَادُ عَنِ التَّكْفِيرِ : دوورکەوتنەوە لە بەکافردانان و کافرکردن و تەکفیرکردنی خەڵك

٧٢- تَوْقِيرُ الْعُلَمَاءِ بَدَلَ تَحْقِيرِهِمْ : ڕێزگرتن لە زانایان لەبری سوکایەتی پێکردنیان[١]

---

(١) پەرتووکی (هەستانەوەی ئومەت) لە نووسینی خۆم: صلاح الدين أحمد.

# هەڵگەرانەوە (الردة) لە زمانەوانی و شەرع دا

## الردة (هەڵگەرانەوە) لە زمانەوانیدا:

الارتداد والردة: هو الرجوع في الطريق الذي جاء منه، لكن الردة تختص بالكفر، والارتداد يستعمل فيه وفي غيره.

ئەم دوو وشەیە (الارتداد والردة) واتە: گەڕانەوە لەو شوێنەی کە لێیەوە هاتووە.

(الردة) بەتایبەت بۆ کوفر بەکار دێت.

(الارتداد) بۆ کوفر و بۆ غەیری کوفریش بەکار دێت.

(الردة) بەمانای گێڕانەوە دێت: جا گێڕانەوەی خودی شتەکە بێت، وەک ﴿وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ۝٢٨﴾ الأنعام◉ واتە: ئەگەر بگێڕدرێنەوە بۆ دونیا دەگەڕێنەوە سەر کارە بەدەکانیان.

یان گێڕانەوە لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دی، وەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ۝١٤٩﴾ آل عمران، واتە: ئەگەر بە قسەی کافرەکان بکەن لە دوای ئیمان هەڵتان دەگێڕنەوە و دەتان کەنە کافر، کەواتە حاڵەتیان دەگۆڕێ لە ئیمانەوە بۆ کوفر.

## (الردة): لە زاراوەی شەرعدا بریتییە لە:

هەڵگەرانەوە لە ئیسلام، جا بە بیروباوەڕ بێت، یان بە کردەوە و گوفتار، بەمەرجێ: کەسەکە ژیر و باڵغ بێت و ناچار نەکرابێت، وە بزانێ ئەوە کوفرە و هەڵگەرانەوەیە و پێی کافر دەبێ و لە ئیسلام دەردەچێت.

جا هەر کەسێک لە دوای بڕوا هێنانی بە ئیسلام ئینکاری و نکۆڵی هەر شتێک بکات کە لە دیندا بە پێویست دانرابێت پێی کافر دەبێت، وەک بنچینەکانی ئیمان و ئیسلام یان ئەوانەی حەڕامی ڕوون و قەتعین وەک: زینا و ریبا و کوشتنی بەناهەق و ...

مەرج نییە تەنها بە نکوڵی کردن بێت (جحود)، بەڵکو بەگاڵتە پێکردنیش بێت، یان عینادی کردن و سەرکێشی یان پشت تێکردنی دڵ و جەستە، یان ڕەتکردنەوەی فەرمانی خوا بێ لە ڕووی خۆ بەزلگرییەوە وەک شەیتان، یان تەرک نەکردن بێت، وەک ئەوە کەسەکە سوجدە بۆ بتێک یان کەسێک ببات، یان لە دژی فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا گوێرایەڵی کەسێک بکات، یان گومان لە ڕاستییەکانی دین بکات، بەڵام کەسێک ئینکاری وردەکارییەکان بکات پێی کافر نابێت، وەک ئەوەی ئینکاری سزای ناو گۆڕ بکات، یان پێی وابێت تەرازووی قیامەت شتێکی ماددی و بەرجەستە نییە، بەڵکو شتێکی غەیرە ماددیە....

## هەڵگەڕانەوە لە ڕوانگەی عەقڵ و نەقڵەوە

**١.** یەکەم هەڵگەڕاوە لە دین لە مێژوودا شەیتان بوو، ئەی بۆ خوای گەورە زۆرترین تەمەن و هێزی پێدا؟! (وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ) ﴿٣٤﴾ البقرة. کاتێکیش بە فریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێزو بەفەرمانی خوا، وەکو ڕووگەیەک) سوژدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کرد و خۆی بە گەورەزانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە.

کەواتە پێشتر کافر نەبوو دواتر کافر بوو بەڵام خوای گەورە بڕیاری کوشتنی بۆنەدا.

**٢.** خوای گەورە خۆی کافری دروست کردووە، ئەی بۆچی دەیکوژێت؟! مادام دەستدرێژی و سنووربەزاندنی بۆ مافی خەڵک نەکردووە. (هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) ﴿٢﴾ التغابن. ئەو زاتە ئەوەیە ئێوەی دروست کردووە، جا هەتانە بێ باوەڕە و هەتانە باوەڕدار، خوایش بینایە بە هەموو ئەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

**٣.** خوای گەورە مرۆڤایەتی بۆ تاقیکردنەوە درووست کردووە، ئەگەر مرۆڤ ئازاد نەبێت چۆن تاقیدەکرێتەوە؟!

**٤.** چـۆن دەتوانێت چـاک و خـراپ هەڵبژرێت ئەگەر توانـای نەبێ و دەستبەسەر بێت.

**٥.** ئیبراهیم (علیە السلام) بۆ مسوڵمانەکان پاڕایەوە و داوای ڕزق و ڕۆزی بۆ کردن، بەڵام خوای گەورە فەرمووی من ڕۆزی کافرەکانیش دەدەم: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾﴾ البقرة. (یادی ئەوە بکەنەوە) کاتێک ئیبراهیم دوعای کردوو وتی: پەروەردگارا دەورووبەری ئەم ماڵەت بگێڕە بەشارێکی پڕ لە ئاساییش و ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆر ببەخشە بە دانیشتوانی، (بەتایبەت) بە وانەی باوەڕیان بە خوا و ڕۆژیی دوایی هێناوە. (خوای گەورە وەڵامی دایەوە کە دوعات گیرایەو) فەرمووی: بەڵام ئەوەش کافرە بێ بەشی ناکەم لە بەرهەم و ناز و نیعمەتی کەمتەمەنی ئەم دنیایە، بەڵام لەوەو دوا بە ناچاریی تووشی سزای ئاگری دەکەم کە سەرئەنجام و چارەنووسێکی خراپە.

**٦.** بەدرێژای مێژوو پێغەمبەران لەسەردەمی نووح تا سەردەمی موسا (سەلامی خوایان لێبێت) و شوێنکەوتووەکانیان کەمینە و چەوسێنراوە بوون مەگەر کەمێک لەسەردەمی یوسف (علیە السلام) بەدواوە نەبێ، پرسیارەکە ئەوەیە: ئەگەر لەبەر هەڵگەڕانەوە و خۆجیاکردنەوە لە خەڵک کوژران دروست بێ، ئەوە بێباوەڕەکان بە حەقی خۆیان زانیوە کە پێغەمبەر و شوێنکەوتووەکانیان بکوژن و بچەوسێننەوە، _کە کردوشیانە _، باشە چۆن دەکرێ مسوڵمان کە دەسەڵاتی هەبوو هەمان ڕەفتاری دزێو و ناقۆڵا دووبارە بکاتەوە کە کاتی خۆی کافرەکانی سەردەمی نووح و ئیبراهیم و لوط و هود و سالح و شوعەیب و موسا (علیهم السلام) کردوویانە؟!.

**٧.** چۆن دەکرێ بابەتێکی ئاوا گرنگ قورئان باسی نەکات، لەکاتێکدا چەندین شتی زۆر لەوە ئەهوەنتر باس کراوە، باسی چوونە ماڵان

کراوە، باسی لەچک و سەرپۆش کراوە، باسی درۆ و بوهتان و دزی و... کراوە، لەکاتێکدا کوشتنی هەڵگەڕاوە لە هەموو ئەم بابەتانە گەورەترە؟!.

**٨.** بیروباوەڕ بە دڵ قبوڵ دەکرێ، چۆن دەکرێت بە تۆبزی تۆبە بە کەسێک بکەیی و بیکەیە مسوڵمان!؟.

**٩.** ئەگەر کەسێک بە درۆ مسوڵمان بێت دەبێتە (منافق) دووڕوو، ئایا کامەیان ئەهوەنتر و کەمزیانترە؟

**١٠.** مورتەدد واتە کافر، کافر ئەگەر مسوڵمان بێ خوای گەورە لە گوناهەکانی دەبورێت: (قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغۡفَرۡ لَهُم مَّا قَدۡ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدۡ مَضَتۡ سُنَّتُ ٱلۡأَوَّلِينَ) ﴿٣٨﴾ الأنفال، ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) بەکافران بڵێ: ئەگەر کۆڵ بدەن و واز بهێنن و (باوەڕبهێنن)، ئەوە بێگومان چاوپۆشی لە گوناهی ڕابردوویان دەکرێت، خۆ ئەگەر بگەڕێنەوە و بەبەردەوامی دژایەتی (ئاینی خوا) بکەن، جا ئەوە بەڕاستی یاسای نەتەوە یاخی بووە پێشینەکانیان بەسەردا دەسەپێنرێت.

بەڵام خوای گەورە گەورەترین سزای بۆ مونافیق داناوە: (إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا) ﴿١٤٥﴾ النساء. بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خواری ناو دۆزەخدان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەست ناکەوێت.

وە قورسترین مەرجیشی بۆ تەوبەکەی داناوە: (إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمًا) ﴿١٤٦﴾ النساء. جگە لەوانەیان: تەوبەی ڕاستەقینەیان کردووە. کارو و نیەتیان چاک کردووە. دەستیان

بە ئایینی خواوە گرتووە و پەیڕەوی بەرنامەکەی دەکەن. بەتەواویی دین و ئاینییان ساغ کردۆتەوە بۆ خوا.

**١١.** لەکاتێکدا ئیسلام باسی ئازادی بیروباوەڕ و بیروڕای کردووە لەهەموو دونیادا باس و خەبەرێکی ئەوتۆی نەبوو، خێرە ئێستا هەموو دونیا باسی دەکا و شانازی پێوە دەکات، کەچی مسوڵمانان لێی پاشگەز بوونەوە!؟! وەک بابەتی کۆیلەی لێهاتووە! ئیسلام پێش هەموو دونیا جاڕی ئازادی بۆدا، هەندێک مسوڵمانی ناحاڵی _ ئەمسالی داعش و قاعیدە _ تازە شانازی پێوە دەکەن!

**١٢.** هەتا کەی ئێمە چاومان لەسەر وتەی زانایانی پێشین چاومان چڕ دابگرین و پەکی ژیری خۆمان بخەین؟! من پێم وایە ئێمە لەسەردەمی ئەوان باین قسەی ئەوانمان دەکرد، ئەگەر ئەوانیش لەسەردەمی ئێمە بان قسەی ئێمەیان دەکرد، بۆیە دەبێ بۆسەردەمی خۆمان بژین نەوەک لە ڕابردوو، بائەوەش بزانین ئەوە تەنیا پێغەمبەرانن جارێکی تر درووست نابنەوە، بەڵام لەهەموو سەردەمێکدا زەوی خاڵی نابێ لە زانا و دانا و شەرعزانی دڵسۆز بۆ خواو خەڵک.

**١٣.** هەنگاوی یەکەممان بۆ هەستانەوە واز هێنانە لە شوێنکەوتنی کوێرانە بۆ خەڵکانی تر، هەتا ئەگەر ئەو خەڵکانە زانایانی ڕابردووی خۆشمان بن، ئێمە قەت لە چاکە و منەتی ئەوان دەرناچین، چونکە ئەم دینە ئەوان بۆ ئێمەیان گواستۆتەوە بە هەموو زانستەکانەوە، ئێمە دەبێ نزایان بۆ بکەین، خوای گەورە بە دڵی پاک و نزا بەرامبەری ئەوان وەسیەتمان دەکا وەک دەفەرموێت: (وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ) ﴿١٠﴾ الحشر. ئەوانەش کە بە شوێن

کۆچبەران و پشتیواناندا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دوعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمە و لەم برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و هیچ جۆرە بوغز و کینەیەک مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا تۆ بەڕاستی بەسۆز و بەخشندە و میهرەبانیت.

## ئازادی بیرو باوەڕ لە قورئاندا

**قورئان پڕییەتی لە ئازادی و ڕێپێدانی بۆ نموونە:**

١. لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (البقرة: ٢٥٦). بە هیچ جۆرێک زۆر لێ کردن لە دیندا نی یە (بۆ هاتنە ناو ئیسلام) چونکە بەڕاستی لە یەک جیابۆتەوە ڕێنموونی و شارەزایی لە گومڕایی و سەر لێ شێواویی (ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەوانەی ئایینی ئاسمانیان هەیە) ، ئینجا هەر کەس لە ڕێ ی بێ بڕوایی بگەڕێتەوە(بێ باوەڕ بێ بە هەر پەرستراوێک جگەلە خوا) وە بڕوا بهێنێ بەخوا ئەوە بێگومان بە توندی دەستی گرتووە بە دەستەگیرەیەکی قایمی بەهێزی وا (کە ئیسلام، یان ئیمانەکەیەتی) کە پچڕان و بەربوونی بۆ نی یە وە خوا بیسەری زانایە.

٢. وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ. یونس: ٩٩وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە بڕوای دەهێنا ئەو (خەڵکەی) وا لە زەوی دا هەموو تێکڕا دەی ئایا تۆ (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) زۆر لە خەڵکی دەکەیت هەتا ببنە بڕوادار.

٣. قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ (هود: ٢٨) نووح وتی: ئەی گەلەکەم هەواڵم بدەنێ ئەگەر من بەڵگەی ئاشکرام هەبێت لەلای پەروەردگارمەوە و ڕەحمەتێکی پێ بەخشیبم لەلایەن خۆیەوە بەڵام

ئەوە لە ئێوە شاردرابێتەوە ئایا بە زۆر پابەندتان بکەین پێیەوە لە کاتێکدا ئێوە حەزی لێ ناکەن.

٤. وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا (الكهف: ٢٩)بڵێ حەق (ئەم قورئانە) لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ و هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران ئاگرێک کە بڵێسەکەی (وەکو ڕەشماڵ) دەوریان دەدات وە ئەگەر (لە تینوانا) هاواری ئاو بکەن ئاوێکیان بۆ دەهێنرێ وەک مسی تواوە (یا وەک چڵک و چەپەڵی ڕۆن زەیت وایە) ڕوو دوم و چاوەکان دەبرژێنێ ئای چ خواردنەوەیەکی پیس و خراپە و ئای چ شوێن و جێگایەکی خراپە.

٥. فَٱعْبُدُواْ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ (الزمر: ١٥) بە بێ باوەڕان بڵێ ئێوەش جگە لە خوا چیتان ویست بیپەرستن بڵێ بێگومان زەرەرمەندان کەسانێکن کە خۆیان و کەس و کاریان لەدەست داوە لە ڕۆژی قیامەت دا بێداربن هەر ئەوەیە زەرەر مەندی ئاشکراو دیار.

٦. فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ (الغاشية: ٢١) کەوابوو ئامۆژگاری بکە، تۆ هەر ئامۆژگارییت.. لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ (الغاشية: ٢٢) تۆ دەسەڵات دار نیت بەسەریاندا.

٧. مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (النحل: ١٠٦) ئەو کەسەی بێ باوەڕ بێ بە خوا لەپاشان باوەڕ

هێنانی مەگەر کەسێک زۆری لێ کرا بێت و دڵیشی دامەزراو بێت بە باوەڕ بەڵام کەسێ دڵی خۆش و شادمان بێت بە بێ باوەڕی ئەوە بەر خەشم و قینی خوا کەوتوون و سزای گەورەیان دەبێ.

٨. قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ (یونس: ١٠٤) بڵێ ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە لە گوماندان لە (ڕاستی) ئایینەکەم ئەوە من ناپەرستم ئەوانەی کە ئێوە دەی پەرستن بێجگە لەخوا بەڵکو ئەو خوایە دەپەرستم کە ئێوە دەمرێنێ وە من فەرمانم پێ کراوە کە لە بڕواداران بم.

٩. فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ (الشوری: ١٥)کەواتە تۆ بۆ ئەوە بانگەواز بکەو ڕاست بە لەسەر ئایینەکەت بەو جۆرەی فەرمانت پێ کراوە وە شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە وە بڵێ باوەڕم هێناوە بە هەر نامەیەک کە خوا ناردویەتیە خوارەوە وە فەرمانم پێ دراوە کە دادپەروەر بم لە نێوانتاندا خوا پەروەردگاری ئێمەو ئێوەشە (پاداشتی) کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانە و (پاداشتی) کردەوەی ئێوەش بۆ خۆتانە هیچ بەڵگەیەک نەماوە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا (باس نەکرابێ) خوا (لە ڕۆژی دوایی دا) کۆمان دەکاتەوە گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

١٠. وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (البقرة: ١٠٩) زۆر لەخاوەن

نامەکان ئاواتە خوازن کەبتانکەنەوە بە بێ بڕوا ، دوای بڕوا هێنانتان لەبەر حەسوودییەک کە لەسرووشتیانەوەیە(ئەمەش) دوای ئەوەی کەڕاستیەکەیان بۆ ڕوون بۆتەوە بەڵام ئێوە لێیان خۆش بن و چاو پۆشیان لێبکەن تا خوا فەرمانی خۆیتان بۆ دەنێرێت بێگومان خوا بەدەسەڵاتە بەسە هەموو شتێکدا.

**١١.** يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ (التوبة: ٧٣) ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جیهاد بکە دژی بێ باوەڕان و دووڕوان وە توندبە لە دژیان شوێنی حەوانەوەی ئەوانە دۆزەخە کە دوارۆژ و چارە نوسێکی خراپە.

**١٢.** يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ (التوبة: ٧٤) دووڕووەکان سوێند دەخۆن بەخوا (ئەو وتانەی دراوەتە پاڵیان) نەیان وتووە سوێند بەخوا بێگومان وتەی بێ باوەڕییان وتووە وە بێ بڕوا بوونەتەوە لەپاش موسوڵمان بوونیان و نیازی شتێکیان بوو بەڵام بۆیان نەکرا(کوشتنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کاتی گەڕانەوەی لە تەبووک) وە هیچ ڕەخنە و ڕقێکیان نەبوو تەنها ئەوە نەبێ کە خواو پێغەمبەرەکەی(بڕوادارانیان) دەوڵەمەند کردووە لە بەهرەی خۆی ئینجا ئەگەر ئەوان بگەڕێنەوە و پەشیمان ببنەوە ئەوە چاکترە بۆیان وە ئەگەر ڕوو وەرگێڕن ئەوە خوا سزایان دەدات بە سزایەکی سەخت لە دنیاو پاشەڕۆژدا وە لە زەوی دا نی یە بۆ ئەوان هیچ دۆست و یارمەتی دەرێک.

**١٣.** إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ (محمد: ٢٥) بێگومان ئەو کەسانەی پاشەوپاش گەڕانەوە (لە ئایینەکەیان) لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کردبوون وە بە هیواو ئومێد فریوی دابوون.

**١٤.** يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرًا لَّكُمۡ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا (النساء: ١٧٠) ئەی خەڵکینە بێگومان پێغەمبەر هێناویەتی بۆتان ڕاستی و ڕەوا لە لایەن پەروەردگارتانەوە کەواتە ئێوەش باوەڕ بهێنن چاکترە بۆتان وە ئەگەر باوەڕ نەهێنن ئەوا بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە هی خوایە وە خوا هەمیشە زانای دانایە واتە کاردروستە.

**١٥.** قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ فَمَنۡ أَبۡصَرَ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ عَمِيَ فَعَلَيۡهَاۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ (الأنعام: ١٠٤) بەڕاستی لە لایەن پەروەردگارتانەوە چەندین بەڵگەی ڕوونتان بۆ هاتووە ئینجا هەرکەس بیر لە ڕاستی دەکاتەوە و دەی بینێ ئەوە (سوودی) بۆ خۆیەتی هەر کەسیش بیر ناکاتەو و کوێر بووە ئەوە (زیانی) هەر بۆ خۆیەتی وە من چاودێر و پارێزەر نیم بە سەرتانەوە، واتە بەس ڕاگەیەنەرم.

**١٦.** وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ (النمل: ٩٢)وە (فەرمانم پێ دراوە کە) قورئان بخوێنم (بەسەر خەڵکی دا) جا هەر کەس هیدایەتی وەرگرت ئەو بێگومان تەنها بۆ خۆی هیدایەت وەردەگرێ (قازانجەکەی بۆ خۆیەتی) هەرکەسیش گومڕا بێت (زیانی بۆ خۆیەتی) وە بڵێ: بەڕاستی من تەنها یەکێکم لە ترسێنەران.

**١٧.** إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ (الزمر: ٤١) بەڕاستی ئەم قورئانەمان بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە بۆ هەموو مەردوومان بەهەق و ڕاستی جا هەرکەسێ ڕێنموون بێ ئەوە قازانجی هەر بۆ خۆیەتی هەر کەسیش لاڕێ بێ ئەوە بەڕاستی زیانی گومڕا بوونەکەی هەر بۆ خۆیەتی وە ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تۆ بریکار نیت بەسەریانەوە (تا بڕوا) بهێنن.

**١٨.** مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا (الإسراء: ١٥) هەر کەس ڕێنموونی وەرگرتبێ ئەوە بێگومان ڕێنمونیەکەی هەر (سوودی) بۆ خۆیەتی و هەرکەسیش گومڕا بووبێ ئەوە بێگومان (زیانەکەی) هەر لە دژی خۆیەتی وە هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێ ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین بۆیان.

**١٩.** مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ (الروم: ٤٤) هەر کەس بێ باوەڕ بوو بێ ئەوە (تۆڵەی) بێ باوەڕیی یەکەی لەسەرە هەرکەسیش کردەوە چاکی کردبێ ئەوە شوێن بۆ خۆیان (لە بەهەشتدا) ئامادە دەکەن.

**٢٠.** هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا (فاطر: ٣٩) هەر ئەو زاتە ئێوەی کردە جێنشین (ی پێشوان) لە زەویدا ئەوسا هەر کەس بێ باوەڕ بێ ئەوە (تۆڵەی) بێ باوەڕییەکەی هەر بۆ خۆیەتی و بێ باوەڕی کافران هیچیان بۆ زیاد ناکات لای پەروەردگاریان

جگە لە خەشم و ڕقی زۆر وە بێ باوەڕی کافران هیچیان بۆ زیاد ناکات بێجگە لە زەرەرمەندی.

**٢١.** إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ (الزمر: ٤١) بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ دابەزاندووە تا هەرچی ڕاستیەکانە بۆ خەڵکی ڕوون ببێتەوە، جا ئەوەی ڕێبازی هیدایەت بگرێتە بەر، ئەوە خۆی قازانجی کردووە، ئەوش کە گومڕابووە، گومڕابوونەکەی لەسەر خۆی دەکەوێت، وەنەبێت تۆ چاودێرو پاڵپێوەنەریان بیت (تا بەزۆر بیانخەیتە سەر ڕێبازی هیدایەت).

**٢٢.** خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ (الأعراف: ١٩٩) کاری ئاسان لەخەڵکی داوا بکەو چاوپۆشی لە هەڵەو کەموکوڕیەکانیان بکەو، فەرمان بدە بە چاکەو کردەوەیەک کە پەسەندی شەرعە، ڕووش وەرگێڕەو پشت بکە لە نەفام و تێ نەگەیشتوان.

**٢٣.** نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ (ق: ٤٥) ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئێمە چاک ئاگادارین بەوەی کەدەیڵێن و چۆن دژایەتی ئەم ڕاستی یە دەکەن ! ... خۆ تۆ زۆردارنیت بەسەریانەوە تا باوەڕیان بەسەردا بسەپێنیت ..کەواتەتۆ تەنها ئەوەت لەسەرەکەبەقورئان یاداوەریی ئەو کەسانەبکەیت کەلەهەڕەشەکانی ئێمە دەترسن .

**٢٤.** إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ (الحج: ١٧) بەڕاستی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و ئەوانەش کە بوونەتە جوو، لەگەڵ صابئەکاندا کە فریشتە پەرست؛ یان ئەستێرە

پەرستن و گاورەکان و ئاگرپەرستەکان و ئەوانەی کە هەوەڵایان (بۆ خوا) بڕیارداوە، بێگومان خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا جیایان دەکاتەوە لەیەکترو بڕیاری خۆی دەدات لەسەریان، بەڕاستی خوا شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە.

٢٥. أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوٓءُ عَمَلِهِ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ (فاطر: ٨) ئایا ئەو کەسەی کە کردەوە ناشیرینەکانی بۆ ڕازێنراوەتەوە و بە جوان و چاک دەیبینێت؟! (وەک ئەو کەسە وایە کە پێوەری خوایی پێیە بۆ چاکە و خارپە)؟ بەڕاستی خوا بیەوێت هەر کەس گومڕا بکات دەیکات، هەر کەسێکیش هیدایەت بدات دەیدات، (ئەڵبەتە نەک بەشێوەی هەڕەمەکی) کەواتە تۆ بە خەفەرتیانەوە خۆت مەفەوتێنە، چونکە بەڕاستی خوا ئاگاو زانایە بەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

٢٦. أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَـٰذِبٌ كَفَّارٌ (الزمر: ٣) ئاگاداربن: دینی پاک و خاوێن تەنها بۆ خوایە، ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە، لەکاتێکدا ئەوان لەخواوە نزیکترن، بێگومان خوا داوەری دەکات لە نێوانیاندا، لەو شتانەدا کە کێشەیان لەسەری هەیەو ڕایان دەربارەی جۆراو جۆرە، بەڕاستی خوا ئەو بیروباوەڕ چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن.

**٢٧.** فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِ فَقَدِ ٱهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ (البقرة: ١٣٧) جا ئەگەر ئەوان (جولەکەو گاورەکان) باوەڕیان هێنا، وەک ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێ هێناوە، ئەوە بەڕاستی مانای وایە ڕێبازی هیدایەتیان دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەگەر پشتیان تێکرد، ئەوە بێگومان دەکەونە دژایەتی و دوبەرەکی یەوە (بەڵام دڵنیابە ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار) خوا تۆ دەپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان چونکە ئەو خوایە زۆر بیسەرو زانایە.

**٢٨.** وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ (هود: ١١٨) خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە هەموو خەڵکی دەکرد بەیەک تاقم و کۆمەڵ، (بەڵام) بەردەوامیش ئەو خەڵکە جیاوازن لەنێوانی یەکتردا لە ئایین و بەرنامە و بۆچووندا...

**٢٩.** ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ (النحل: ١٢٥)ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەی ئیماندار) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامەو ڕێبازی پەروەردگارت بەحیکمەت و دانایی (بۆ هەندێک) و ئامۆژگاری جوان و بەجێ، (بۆ هەندێکی تر)و گفتو گۆو موجادەلە بەجوانترین شێوە (لەگەڵ هەندێکی تردا بە تایبەتی خاوەن کتێبەکان)، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە، کە کێ گومڕایە، هەروەها هەر خۆیشی زانایە بە هیدایەت و وەرگران.

**٣٠.** قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنَا عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ (یونس: ١٠٨) ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی حەق

و ڕاستیتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، ئەوەی ڕێبازی هیدایەتی وەرگرتبێت ئەوە سوودی بۆ خۆیەتی، ئەوەش گومڕا بووبێت و ڕێی ون کردبێت، ئەوە گومڕاییەکەی لەسەر خۆی دەکەوێت و من لێپرسراوو چاودێر نیم بەسەر کارو کردەوەی ئێوەوە.

**٣١.** وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ (الرعد: ٣١)خۆ ئەگەر بەڕاستی لە جیاتی ئەم قورئانە، خوا قورئانێکی ڕەوانە بکردایە کە کێوەکان پێی بڕۆشتنایە، یان زەوی پێ هەڵکەنرایە و لەت بکرایە، یان مردووەکانی پێ بهاتایە قسەو گفتوگۆی لەگەڵدا بکرایە، خوانەناسان هەر بڕوایان نەدەهێنا، بەڵام دڵنیابن کە هەموو کارێک و هەموو شتێک بەدەست خوایە، باشە، ئایا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە نائومێد نەبوون (لە بێ دین و خوانەناسان، خۆ هیدایەت بە زۆر نیە؟) جا ئەگەر خوا بیوستایە هەموو خەڵکی ناچار دەکرد کە هیدایەت وەربگرن (خوانەناسان وەنەبێت ژیانی دنیا بەخۆشی بەرنە سەر، بەڵکو) بەردەوام ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون بەڵای سەخت و ناخۆشیان تووش دەبێت بەهۆی ئەو کارو پیشەیەوە کە ئەنجامیان داوە، یاخود ئەو بەڵا سەختانە لە نزیک ماڵەکانیانەوە دادەبەزێت و سەرهەڵدەدات، هەتا بەڵێنی خوا دێتە دی، بەڕاستی خوا پەیمانی ناشکێنێت و دەیهێنێتە دی.

**٣٢.** وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ (هود: ١٢١) بڵێ بەوانەش ئیمان ناهێنن و نیازیان وایە فەرمانبەرداری تۆ نەبن، ئێوە لە شوێنی خۆتاندا کاری خۆتان بکەن و بەڕاستی ئێمەش هەمیشە خەریک دەبین و کاری خۆمان دەکەین.

**٣٣.** أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوٓءُ عَمَلِهِ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ (فاطر: ٨) ئایا ئەو کەسەی کە کردەوە ناشیرینەکانی بۆ ڕازێنراوەتەوە و بە جوان و چاک دەیبینێت؟! (وەک ئەو کەسە وایە کە پێوەری خوایی پێیە بۆ چاکە و خارپە)؟ بەڕاستی خوا بیەوێت هەر کەس گومڕا بکات دەیکات، هەر کەسێکیش هیدایەت بدات دەیدات، (ئەڵبەتە نەک بەشێوەی هەڕەمەکی) کەواتە تۆ بە خەفەرتیانەوە خۆت مەفەوتێنە، چونکە بەڕاستی خوا ئاگاو زانایە بەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

**٣٤.** لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ (الممتحنة: ٨) دڵنیاش بن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات کە چاک ڕەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگیان دژ نەکردون و دژایەتی ئاینیان نەکردون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردون، چونکە بەڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت.

**کەواتە لە هەموو ئایەتەکاندا چەند شتێك دەخوێندرێتەوە:**

**١.** هەموو کەسێک ئازادی بیروباوەڕی هەیە.

**٢.** تۆبزی و زۆر لە کەس ناکرێت.

**٣.** هەر سزایەک هەبێت بۆ هەڵگەراوەی ئاشتی خواز یان بێباوەڕی ئەسڵی لە قیامەتدایە نەک لە دونیا، بۆیە ئەگەر لە ئایەتەکان وردبینەوە سزای دونیایی بۆ دانەناون و لە هەموویاندا دەفەرموێت: لە قیامەتدا سزا دەدرێن.

**٤.** ئاشتی ئەسڵە و هەتا هێرش نەکرێت هێرش نابرێت، هەتا شەڕ نەخوازرێت شەڕ ناکرێت، هەتا ئاشتی هەڵبژێرن پێکەوە ژیانیان لەگەڵدا دەکرێت.

## بەڵگەی زانایان دەربارەی کوشتنی هەڵگەڕاوە

زۆربەی زانایانی کۆن لەگەڵ کوشتنی هەڵگەڕاوەدان، بەڵام ئەگەر بەوردی سەیری بەڵگەکانیان بکەین، هیچ بەڵگەیەکی سەریحی سەحیح نادۆزینەوە لەگەڵ ئەم حوکمە قورسەدا بێت، کەواتە بابەتەکە زیاتر پەیوەندی هەبووە بە لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پاراستنی دەوڵەت و موسڵمانان لە موئامەرە و ...، زانایانیش عوزری خۆیانیان هەبووە لەم ڕووە کە ئەم دەرگایەیان لەم سەردەمانەدا نەکردۆتەوە بە ڕووی نەیاراندا تاوەکو بە فێڵ و موئامەرە دزە بکەنە ناو موسڵمانەوە و حوکمەکەیان زۆر قورس کردووە، دەشکرێ بەشێکیشی بگەڕێتەوە بۆ تەفسیری هەڵە و جەمع نەکردنی دەقەکان و ...، کەواتە هیچ بەڵگەیەکی سەریحی سەحیح نادۆزینەوە لەگەڵ ئەم حوکمە قورسەدا بێت، بەڵام ئێمە بەڵگەکانیان دەخەینە ڕوو بەکورتی و بە کورتیش وەڵامیان دەدەینەوە:

**بەڵگەکانیان لە قورئاندا :**

**١.** خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ) ﴿٣٣﴾ المائدة.

بێگومان پاداشتی ئەوانەی کە دەنجێگن و دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی فەساد و بەدڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە: (ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە)

دەبێت بکوژرێن، (ئەوانەش کەخەڵکیان کوشتووە و جەردەییشیان کردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، (ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن) دەست و قاچێکیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان کە مەترسیان لێدەکرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە وڵات، ئەو سزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لە دنیادا، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆهەیە.

زانایان ئەم ئایەتەیان بە یەکێک لە بەڵگەکان هەژمار کردووە بۆ کوشتنەوەی هەڵگەڕاوە، بەڵام ئەگەر بەوردی سەیری بکەین بەڵگەیە لەسەریان نەک بەڵگە بێت بۆیان، چونکە ئەم ئایەتە وەک دواتر باسی دەکەین دەربارەی عورەینەییەکان دابەزیوە، کە دەربارەی ئاژاوە و کوشتنی بە ناهەق و چەتەگەری بووە، چونکە کوشتن و چەتەگەری و ئاژاوەیان نایەوە و هەڵیش گەڕانەوە، کەواتە لەبەر هەڵگەڕانەوە نەبوو، لەبەر کوشتنی بەناحەق و چەتەگەری بوو (وەک باسی دەکەین)، ئینجا ئەگەر سەیری بکەین ئایەتە دەفەرموێت: ((يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ)) و ((وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن)) کەواتە دوو هۆکاری زۆر زەق هەیە: موحارەبە و شەڕکردن، وە ئاژاوە نانەوە و خراپەکاری، ئینجا ئەگەر سەیری بکەین چوار حوکمی بۆ داناوە، کوشتن، لەسێدارەدان، دەست و قاچ بڕین، دوورخستنەوە، کەواتە بەچ بەڵگەیە کوشتەکە دیاریکراوە و سەپێنراوە؟! لەکاتێکدا چوار سزای باسکردووە، کە هەرکامێکیان بۆ کەسی خۆیەتی، کەواتە بەکورتی ئەم ئایەتە دوور و نزیک نییە پەیوەندی بە هەڵگەڕانەوە نییە و پەیوەستە بە چەتەگەری و ئاژاوە نانەوە و خراپەکاری و دژ وەستانەوەی دەوڵەت.

٢. يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ. التوبة ( ٧٣ ). ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دژی

کافرو دووڕووەکان تێبکۆشە و توندبە لەسەریان، ئەوانە سەرئەنجام و مەنزڵگەیان دۆزەخە، ئای کە سەرئەنجامێکی خراپ و ناشرینە.

يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِن فَضْلِهِ فَإِن يَتُوبُوا يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ وَإِن يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَا لَهُمْ فِي الْأَرْضِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ. التوبة ( ٧٤ ). (دووڕووەکان سوێند بەخوا دەخۆن کە قسەیەکی نابەجێیان نەکردووە، کەچی سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە درۆ دەکەن، بەڵکو گوفتاری کوفرو بێ باوەڕی هات بەدەمیاندا، ئەوانە دوای موسڵمانبوونیان بێ باوەڕ بوونەوە، خەریکی (پیلان)و نەخشەیەک بوون بەڵام بۆیان نەلواو پێی نەگەیشتن (کە شەهید کردنی پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم)، هیچ شتێک ئەوانی تووڕە نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت: خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) ئیماندارانیان دەوڵەمەند و بەهرەوەر کرد لە فەزڵ و زیادە ڕێزی خۆی، جا ئەو دووڕووانە ئەگەر تەوبە بکەن و لە ڕەفتاری نادروستیان پاشگەز ببنەوە ئەوە چاکترە بۆیان، خۆ ئەگەر پشت هەڵکەن و (هەر خەریکی نەخشەو پیلان بن) ئەوە بێگومان خوا سزای بە ئازاریان دەدات لە دنیاو قیامەتدا، کەسیش یارو یاوەرو پشتیوانیان نابێت لە زەویدا.

ئەم ئایەتەش بەبەڵگە دێننەوە، لەکاتێکدا دوور و نزیک حوکمی کوشتنەوەی هەڵگەراوە تێدا نییە، کوشتن حوکمێکی زۆر گەورەیە، بە دەقی سەریحی سەحیح نەبێت ناچەسپێت، ئەگەر سەیری بکەین دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ). دەفەرموێت: (جاهد) واتە: تێبکۆشە، جیهاد دەیان مانای هەیە، نەیفەرمووە: (قاتل)، بەبەڵگەی

سیرەی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە ئەو  نەجەنگاوە لەگەڵیاندا، مەگەر شەڕکەرەکانیان نەبێت، ئەوەش لەدەیان ئایەتی تر ڕوونکراوەتەوە کە دەفەرموێت: جەنگان تەنها لەگەڵ ئەوانەیە کە دەجەنگن نەک ئاشتی خوازەکان، ئینجا ئەگەر لێی وردبینەوە هیچ جۆرە سزایەکی دیاریکراوی دانەناوە، کەواتە سزای کوشتنەکە لەکوێوە هات؟!

٣. لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا. الاحزاب ( ٦٠ ). ئەگەر دووڕووەکان و دڵ بیمارەکان و پڕوپاگەندەچیەکان لە مەدینەدا کۆڵ نەدەن، مۆڵەت و هانی تۆ دەدەین کە تۆڵەیان لێ بسێنیت، (لەوەودوا زۆربەیان دەربەدەر بکەیت)و کەمێکیان نەبێت لە شاردا نەمیننەوە.

مَّلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا. الاحزاب ( ٦١ ). (ئەوانە) نەفرین لێکراون لە هەرکوێ بژین، دەبیت دەستگیر بکرێن و دەبێت بکوژرێن (یان بەکوشت چن) ، (چونکە لە خراپەو پیلان و تاوان و کوشتن و دزی و درۆزنی زیاتر هیچیان لێ نەوەشاوەتەوە).

ئەم ئایەتەش یەکێکە لە بەڵگەکانیان دەربارەی کوشتنی هەڵگەڕاوە، بەڵام ئەگەر لێی وردبینەوە بەهیچ شێوەیەک باسی حوکمی کوشتنی هەڵگەڕاوەی نەکردووە، بەڵکو وەک بەشێک لە ڕاڤەکاران فەرموویانە ئەم دووڕووانە دوو سیفەتیان هەبووە، یەک: تەماعیان کردووە لە ئافرەتی موسڵمانان و بەدوای ژنانەوە بوون و شەهوەتی زینایان هەبووە، هەروەک دەفەرموێت: (الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ)، چونکە لە ئایەتەکەی پێشووتردا خوای گەورە فەرمان بە خۆداپۆشینی ئافرەتان دەکات، دوو: پڕوپاگەندەچییەکان و ئەوانەی هەواڵی درۆ بڵاودەکەنەوە و ئاسایشی گشتی و نەتەوەیی و نیشتیمانی و دەوڵەت تێکدەدەن،

کەواتە ئەم حوکمە بەستراوەتەوە بەم دوو سیفەتە نابوت و زیانبەخشە و باسی هەڵگەڕانەوە و بیروباوەڕ ناکات، ئینجا ئەگەر بڕوانینە سیرە و ژیننامەی کردەیی سەروەرمان (ﷺ) کوشتنی دووڕووەکان نابینین و دووڕوەکانی نەکوشت، کەواتە دیارە ئەمە حەددێکی شەرعی نییە و پەیوەستە بە سیاسەی شەرعی و سەرۆکی وڵات.

وە ئیمامی شەوکانی پێی وایە (وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا) دوعایە، نەک حوکم، واتە بەکوشت چن.

کەواتە بەهیچ شێوەیەک هیچ بەڵگەیەک نییە لە قورئاندا کە حوکمی کوشتن بۆ هەڵگەڕاوەی ئاشتیخواز بچەسپێنێت، ماوەتە بەڵگەکانیان لە سوننە و ئیجماعدا، ئەوانیش لە بابەتەکانی داهاتوودا ڕووندەکەینەوە.

## هەڵگەڕانەوە و چەتەگەری

بەشێک لە زانایان لە کۆن و تازەدا ئەم دوو دەستەواژەیان لێک جیانەکردۆتەوە:

(مرتد ومتمرد) واتە: هەڵگەڕاوە و سەرکەش (یاخی).

(خارج عن الاسلام والخارج على الاسلام) واتە: دەرچوون لە ئیسلام و دەرچوون لە دژی ئیسلام و موسڵمانان و جەنگان لە گەڵیاندا.

هەڵگەڕاوە بە پێی دەقەکانی ئایەت و فەرموودە کێشە دروست ناکات بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، واتە: ئەوەی پێی دەوترێت: مورتەد یان دەرچوو و هەڵگەڕاوە لە ئیسلام، بەڵکو ئەو کەسەی یاخی دەبێت و ئاشووب و ئاژاوە دەنێتەوە و پلانگێڕی دەکات و چەتە و ڕێگری دەکات و بەناهەق کودەتا بەسەر مسوڵماناندا دەکات، ئەو جۆرەیان بەپێی تاوانەکەی سزا دەدرێت، یان دەبەخشرێت ئەگەر بۆ ئیسلام و مسوڵمانان ئەوە باش و سوودبەخش بوو.

جۆری یەکەم واتە: هەڵگەراوە بەبێ ئاژاوە نانەوە، قورئان باسی کردووە و سزاشی بۆ دانەناوە وەک ئەو ئایەتانە:

١. (وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) ﴿٧٢﴾ آل عمران. دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) وتیان بەتاقمێکیان: ئێوە لە سەرەتای ڕۆژدا (بەدرۆوە) ئیمان و باوەڕ بهێنن بەو (قورئانەی) بۆ ئیمانداران ڕەوانە کراوە، بەڵام لەکۆتایی ڕۆژدا و دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە

(تا دوودڵی و گومانیان تێدا دروست ببێت) بۆ ئەوەی پاشگەز ببنەوە.

٢. (كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓاْ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ) ﴿٨٦﴾ آل عمران. چۆن خوا گەلێک هیدایەت دەدات کە دوای ئەوەی باوەڕیان هێنا، هەڵگەڕانەوە و کافر بوون؟ لە حاڵێکدا شایەتییان دابوو کە ئەم پێغەمبەرە حەقەو چەندەها بەڵگە و نیشانەشیان بۆ هاتبوو (لەسەر ڕاستی محمد (صلی الله علیه وسلم)، خوای گەورەش هیدایەت و ڕێنموویی ئەو دەستە و تاقمە ستەمکارە نادات.

٣. (إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ) ﴿٩٠﴾ آل عمران. بەڕاستی ئەوانەی دوای باوەڕ هێنانیان کافر بوون و لەوەودوا زیاتر ڕۆچوون لە کوفر و بێدینیدا، ئەوانە پەشیمانی و تەوبەیان هەرگیز لێ وەرناگیرێت، ئا ئەوانە دەستەی گومڕا و سەرلێشێواوەکانن.

٤. (إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا) ﴿١٣٧﴾ النساء. بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دوایی پاشگەز بوونەتەوە، دووبارە ئیمانیان هێنایەوە و دوایی پاشگەز بوونەوە، لەوەودوا زیاتر لە بێدینی و کافریدا ڕۆچوون، هیچ کات خوا لەوانە خۆشنابێت و ڕێنموویيان ناکات بۆ ڕێبازێکی سوود بەخش.

ئەوانە هەموو هەڵگەڕانەوەن بەڵام مەترسی بۆ سەر کیانی دەوڵەت و کۆمەڵگەی مسوڵمانان دروست ناکەن، زیانەکان بە پلەی یەکەم بۆ خۆیانن، وە مسوڵمانانیش دەیان ناسن بۆیە سزا نادرێن، بەڵکو وریایان

دەبین و چاومان لەسەریان دەبێ و خەڵکیان لێ ئاگادار دەکەینەوە جیهادیان بە ئامۆژگاری و هەندێک جار وریایی دان و هەنێک جار بە پشت گوێ خستن لەگەڵدا دەکەین، بەڵام ئەگەر هەڵگەڕانەوەکەیان هاوکات بوو لە گەڵ ئاشوب و کوشتن و مافیابوون و کودەتا بەناهەق ئەوانە بەپێی تاوانەکەیان سزا دەدرێن بەپێی بەرژەوەندی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەگشتی و کۆمەڵگەی مسوڵمان بەتایبەتی.

## هەڵگەڕانەوە هاوکات لەگەڵ ئاژاوە و چەتەگەری:

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ) ﴿٣٣﴾ المائدة.

بێگومان پاداشتی ئەوانەی کە دەنجێگن و دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی فەساد و بەدڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە: (ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە) دەبێت بکوژرێن، (ئەوانەش کەخەڵکیان کوشتووە و جەردەییشیان کردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، (ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن) دەست و قاچێکیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان کە مەترسیان لێدەکرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە وڵات، ئەو سزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لە دنیادا، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆهەیە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونترین ئایەتە دەربارەی ئاژاوە و کوشتنی بە ناهەق و چەتەگەری، وە پێم وایە زانایان ئەوەندەی تەئویل و تەئویل کاری دەکەن بۆ کوشتنی مورتەد هاتبان ئەو ئایەتەیان بکاردبا

بەڵگە تووشی ئەو هەموو دژیەکی و ڕووبەڕوو بوونەوەی سەڕاحەتی قورئان نەدەبوونەوە و بابەتەکەیان دەپێکا بەبێ ئەوەی دژیەکی لە نێوان قورئان لەگەڵ قورئان و سونەت لەگەڵ سونەت و قورئان لەگەڵ سونەت دا پەیدا ببێت، چونکە ئەوانە هەموو تەواوکاری یەکترن نەوەک دژیەک، چونکە ئایەتەکە زۆر ڕوونە بەتایبەت ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ هۆکاری دابەزینەکەی:

حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ نَاسًا مِنْ عُرَيْنَةَ اجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ، فَرَخَّصَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْتُوا إِبِلَ الصَّدَقَةِ فَيَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَقَتَلُوا الرَّاعِيَ وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ وَتَرَكَهُمْ بِالْحَرَّةِ يَعَضُّونَ الْحِجَارَةَ. رواه البخاری ١٥٠١

عوکل و عورەینە ئەوانە بوون هاتن بۆ مەدینە مسوڵمان بوون، لە مەدینە بەهۆی جیاوازی ژینگە و ئاو و هەواکە نەخۆش کەوتن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) روخسەتی پێدان بچن بۆلای ئەو وشترانەی زەکات، کە شوێنی تایبەتیان لە دەرەوەی شار بۆ دابین کرابوو، بۆ ئەوەی لە میز و شیری وشترەکان بخۆنەوە، ئەوانیش چوون ئەو کارەیان کرد، هەرکە چاکبوونەوە شوانەکەیان کوشت و وشرەکانیشیان بەتاڵان برد و دواییش گەڕانەوە لە ئیسلام، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانی سزادا لە هەقی ئەوەی خیانەتیان لە ئەمانەت کرد، چونکە:

- شوانەکەیان کوشت.
- وشترەکانیان بەتاڵان برد.
- هەڵیش گەرانەوە.

لێرەدا ئاژاوە و هەڵگەڕانەوە بەیەکەوە لەو ڕووداوە دەبینین، بەبێ ئەوەی زانایان وەک پێویست تەرکیزی لەسەر بکەن، لەکاتێکدا فەرموودەکە لە سەرچاوە سەحیحەکاندا هەیە، زۆربەی پەرتووکەکانی هۆکارەکانی دابەزینی قورئان باسیان کردووە، بەڵام ئەوانەی لەگەڵ کوشتنی هەڵگەڕاوەن خۆیان لێ بواردووە، چونکە تەواو پێچەوانەیە لە گەڵ بیروڕاکەی ئەوان.

ئەم فەرمودەیەی کە باسمانکرد لەم سەرچاوانەدا هاتووە: بوخاری دوازدە جار ئەم فەرمودەیەی هێناوە. موسلیم دوو جاری هێناوە. ئەبو داود جارێک هێناویەتی. ترمذی سێ جار هێناویەتی. نەسائی یازدە جاری هێناوە. ئیبن ماجە دوو جاری هێناوە. ئەحمەد زیاتر لە یازدە جاری هێناویەتی.

### لە موفەسیرەکان ئەوانە هێناویانە:

تەبەری، قورتبی، رازی، قاسمی، سیوتی، سەمعانی، ئیبن عربی.

هیچ سەرچاوەیەکی موعتەبەر و پشت پێ بەستراو نییە باسی نەکردبێت.

بەڵام یەک شتی گرنگ هەیە کە لەو ئایەتە وەردەگیرێت: مەرج نییە هەموو کات هەڵگەڕاوەی ئاژاوەگێڕ و چەتە بکوژرێت، وەک لە ئایەتەکە و وردەکاری قسەی زانایان دەردەکەوێت، بەتایبەت ئەگەر تەوبە کردنیان پێش خۆبەدەستەوە دانیان بێت.

## هەڵگەڕانەوە و کودەتا

یەکێکی تر لەو بابەتە گرینگانە کە تێکەڵبوونی تێدا دروست دەبێت بابەتی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام هاوکات لەگەڵ کودەتا، دەبێ ئەم دوو بابەتە لێک جیا بکرێتەوە، (مرتد) جیاییە لە (متمرد)، (خارج عن الإسلام) جیایە لە (خارج على الإسلام).

جۆری یەکەم واتە ئەوەی دەردەچێت لە ئیسلام بەبێ یاخی بوون و کودەتا، حوکمی کوشتن نییە، لەبەر ئەو هەموو بەڵگەی هێنامانەوە، بەڵام ئەگەر یاخی بوون و کودەتای تێدا بوو وەک ئەوەی لەسەردەمی ئەبوبەکر ڕوویدا (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم جۆرەیان گەورەی مسوڵمانان دەستی واڵایە بەوەی ئایا چ جۆرە سزایەکیان بەسەردا جێ بەجێ دەکا وەک لەو ئایەتەدا ڕونکراوەتەوە بە ڕاشکاوی کە دەفەموێت:

(إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ) ﴿٣٣﴾ المائدة. بێگومان پاداشتی ئەوانەی کە دەنجێگن و دووژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی فەسادوو بەد ڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە: (ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە) دەبێت بکوژرێن، (ئەوانەش کە خەڵکیان کوشتووە و جەردەییشیان کردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، (ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن) دەست و قاچێکیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان کە مەترسیان

لێدەکرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە وڵات، ئەوسزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لەدنیادا، لەقیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆهەیە.

هەروەک لە فەرمودەکەشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت (علیه الصلاة والسلام):

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلىَّ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنيِّ رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ ؛ الثَّيِّبُ الزَّانيِ، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ «. رواەالبخاری ١٦٧٦

ئەم فەرموودەیە لەزۆربەی سەرچاوەکاندا هاتووە و گومان لە ڕاست و درووستی فەرموودەکە نییە بۆیە تەخریجی ناوێت.

لەم فەرموودەدا دوو ڕستە هەیە کە زۆر ڕوونە کە بە چ هۆیەک خوێنی کەسەکە حەڵاڵ دەبێت:

ڕستەی یەکەم: (التارک لدینه) ئەوە بەمە لە دین چۆتە دەر و کافر بوو.

بەڵام ڕستەی دووەم بۆمان بەیان دەکات کە تاوانەکە بەس کافر بوون نییە، بەڵکو (المفارق للجماعة) ئایا دەرچوون لە جەماعەت ماناکەی ڕوون نییە لە وەی کە لە کۆمەڵگەی مسوڵمانان جیابۆتەوە و پەیوەندی بەکافرانەوە کردووە؟!

مانایەکە زۆر ڕوونە و ناکرێ بەهەند وەرنەگیردرێت. بەتایبەت لە ڕوایەتی تردا هاتووە کە دەفەرموێت:

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلىَّ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنيِّ رَسُولُ اللَّهِ، إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانيِ،

وَالْمَارِقُ مِنَ الدِّينِ التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ «.رواه البخار ٦٨٧٨

(الْمَارِقُ مِنَ الدِّينِ) واتە: لە دین دەرچوو.

(التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ) واتە: وازی لە جەماوەری موسڵمانان هیناوە.

کەواتە ئەگەر سەرنج بدەین و لێی وردبیتەوە دەبینین دەرچوون لە دینی جیاکردۆتەوە لە دەرچوون لە کۆمەڵی موسڵمانان و پەیوەندی کردن بە دوژمن. کەواتە ئەگەر سیفەتی (التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ) واتە: (وازی لە جەماوەری موسڵمانان هیناوە) تیدا نەبوو ئەوە بەهیچ جۆرێک ئەو حوکمە نایگرێتەوە و ناکوژرێت.

وە لەڕیوایەتی تردا هاتووە کە دەفەرموێت: عن عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: رَجُلٌ زَنَى بَعْدَ إِحْصَانٍ فَإِنَّهُ يُرْجَمُ، وَرَجُلٌ خَرَجَ مُحَارِبًا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِنَّهُ يُقْتَلُ أَوْ يُصْلَبُ أَوْ يُنْفَى مِنَ الْأَرْضِ، أَوْ يَقْتُلُ نَفْسًا فَيُقْتَلُ بِهَا رواه ابوداود. ٤٣٥٣

ئەم فەرموودەیە زۆر بە ڕوونی باس لە دەرچوون و کودەتا دەکات لەسەر مسولْمانان، وە هەروەها هاو واتایە لەگەڵ ئایەتی موحارەبە و فەرمودەکەی پێشووتر و بەسەرهاتەکەی عوکل و عورەینە.

(رَجُلٌ خَرَجَ مُحَارِبًا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ) واتە: دەرچووە و شەڕی ڕاگەیاندووە دژی خوا و پێغەمبەرەکەیی و ئیسلام و موسڵمانان.

بەکورتی بابەتەکە پەیوەدنی هەیە بە خیانەت و دەرچوون لە دەوڵەت و کۆمەڵگە و خەڵک نەوەک دەرچوون لە ئایین، چونکە بە دەرچوونی لە ئایین بەبێ خیانەت و ئاشوب و شەڕ و گێرەشێوێنی هیچ زیانێک لە کەس نادات، بەڵام بەدەرچوونی لە دەوڵەت و کۆمەڵگە

و خەڵک و ئاژاوە و ئاشوب و کودەتا و گێرەشێوێنی زیان بە هەموان دەگەیەنێت، کەواتە مەبەستەکە خیانەت و زیانگەیاتدن و تێکدانی کۆمەڵگە و گێرەشێوێنی و ئاشووبە نە شتی تر.

ئێمە قاعدەیەکی (أصولي) جوانمان هەیە: ئەگەر هاتوو وشەیەک لە دوو دەقدا هاتبوو لە حوکم و سەبەبدا یەک بوون، یەکیان عام بوو و ئەوی تریان خاص، ئەوە دەبێ حەملی عام بکەین بۆ سەر خاص.

کەواتە هەموو ئەو فەرموودانەی کە بە گشتی و عام هاتوون دەبێ ڕاڤە بکرێن بە دەقەکانی تر لە قورئان و سوونەت و سیرەی سەروەرمان (ﷺ) بۆنموونە فەرموودەی: (من بدل دينه فاقتلوه) واتە: هەر کەسێک دینی گۆڕی بیکوژن، ئەم فەرموودەیە عام و گشتییە بەڵام بە پێی یاسا ئوسوڵیەکە: (ئەگەر هاتوو وشەیەک لە دوو دەقدا هاتبوو لە حوکم و سەبەبدا یەک بوون، یەکیان عام بوو و ئەوی تریان خاص، ئەوە دەبێ حەملی عام بکەین بۆ سەر خاص.) دەبێ هەموو فەرموودە عام و گشتییەکان حەمل بکەین و بیانگێڕینەوە بۆ دەقە خاص و تایبەتکراوەکان چونکە تەبدیلی دین (عام)ە، بەڵام (المفارق للجماعة) تخصيص ی دەکا.

**بۆیە ئەم فەرموودە گشتیانە تایبەت دەکرێن بە :**

١- قورئان، چونکە وەک باسمانکرد دەیان ئایەت لەگەڵ ئازادیدایە و دژی کوشتن و تۆبزی لێکردنە، بۆیە تاکە ئایەتێکت دەستناکەوێت کە بفەرموێت: مورتەدد بکوژن.

٢- فەرموودە تایبەتەکان (خاصەکان)، وەک باسمانکرد چەندان فەرموودە بە تایبەتکراوی هاتوون و بە ڕاشکاوی وتوویانە تەنیا ئەوانە دەکوژرێن کە شەڕکەر و ئاژاوەگێڕ و خیانەتکارن.

**٣-** سیرەی جوانی سەروەرمان (ﷺ)، سەیری سەروەرمان دەستەڵاتی تەواوی هەبوو بەڵام هەڵگەڕاوەی ئاشیخوازی هەرگیز نەکوشتووە.

**٤-** مەقاسیدی و شەریعە و یاسا گشتییەکانی ئیسلام دژی ئەوەن، چونکە کوشتنی هەڵگەراوەی ئاشتیخواز هیچ سوودێکی نییە غەیری زەرەر و زیان.

هەروەها فەرموودەکەی ئەبو موسای ئەشعەری و موعازیش بەم واتایە ڕاڤەدەکرێت کە دەفەرموێت:

"فَبَعَثَهُ عَلَى الْيَمَنِ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلَيْهِ قَالَ: انْزِلْ. وَأَلْقَى لَهُ وِسَادَةً وَإِذَا رَجُلٌ عِنْدَهُ مُوثَقٌ، قَالَ: مَا هَذَا ؟ قَالَ: هَذَا كَانَ يَهُودِيًّا، فَأَسْلَمَ، ثُمَّ رَاجَعَ دِينَهُ دِينَ السَّوْءِ، فَتَهَوَّدَ. قَالَ: لَا أَجْلِسُ، حَتَّى يُقْتَلَ قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِه. فَقَالَ: اجْلِسْ نَعَمْ. قَالَ: لَا أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِه. ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَأَمَرَ بِهِ، فَقُتِلَ، ثُمَّ تَذَاكَرَا الْقِيَامَ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا، مُعَاذٌ: أَمَّا أَنَا فَأَنَامُ، وَأَقُومُ، وَأَرْجُو فِي نَوْمَتِي مَا أَرْجُو فِي قَوْمَتِي. رواه مسلم ١٨٢٤

موعاز کە وتی: لە وەڵاخەکەم دانابەزم هەتا ئەو هەڵگەڕاوە نەکوژی، ئەمە بڕیاری خواو پێغەمبەری خوایە دواتر ئەبو موسا کوشتی.

**یەکەم:** ئێمە تەوای ڕووداوەکەمان ئاگا لێ نییە بزانین ئەو کەسە چی کردووە.

**دووەم:** ناکرێ ئەو فەرموودە دژی ئایات و فەرموودەکانی تر بێت.

**سێ:** کرداری هاوەڵان بەڵگە نییە، یان لانی کەم ڕاجیایی لەسەرە.

**چوارەم:** جولەکەکان بەردەوام ناپاکییان کردووە بۆنمونە:

- جولەکەی بەنوو نەزیر ویستیان پێغەمبەر (ﷺ) تیرۆر بکەن.
- جولەکەی بەنوو قەینوقاع خیانەتیان بە مسوڵمانان کرد.

• جولەکەی بەنوو قورەیزە دیسان پەیمانیان هەڵوەشاندەوە و خیانەتیان لە مسوڵمانان کرد.

• جولەکەی خەیبەر ١٠ هەزار کەسیان لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) کۆکردەوە.

یان دەکرێ لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەی باسی ئەهلی کیتاب دەکات و دەفەرموێ: بەیانیان ئیمان دێنن و ئێواران بێباوەڕ دەبن، بۆ هەڵگەڕاندنەوەی ئیمانداران و پشێوی نانەوە و ئاژاوە و کودەتا، یان ئەوانەی گومانی ئەوەیان لێدەکرێت، کەواتە دیسان پەیوەندی بە هەڵگەڕاوەی ئاشتیخوازەوە نییە، بەڵکو باسی ئاژاوە و نانەوە و خراپەرکاری و کودەتایە.

ئەوەی سەردەمی عەلی کوری ئەبی تاڵیب (ڕەزای خوای لێبێت) هەر هەمان شتی لێدەفامرێتەوە وەک لە فەرموودەکەدا هاتووە:

عن عكرمة قَالَ: أُتِيَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِزَنَادِقَةٍ فَأَحْرَقَهُمْ، فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: لَوْ كُنْتُ أَنَا لَمْ أُحْرِقْهُمْ ؛ لِنَهْيِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَقَتَلْتُهُمْ ؛ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ «. رواه البخاري ٦٩٢٢.

ئەو زیندیقانەی کە لەسەردەمی ئیمامی عەلی هێنایانن ئەویش سوتاندنی، دواتر ئیبن عەبباس بەوە ڕازی نەبوو وتی: ئەگەر من بام دەمکوشتن چونکە بەس خوای گەورە بە ئاگر سزا دەدا، کەسی تر بۆی نییە.

ئەم فەرموودەیە ئاحادە و ئاحادیش ناگات بەوەی یەقین لەکاربخات، چونکە خۆی یەقینی تەواو نییە، هەربۆیە زانایان قسەیان لەسەر سەنەدەی کردووە و مشتومڕی زۆری لەسەرە، هەربۆیە ئیمامی موسلیم کە لەوەرگرتنی فەرموودەدا ئاسانکار نییە، ئەم فەرموودەیەی نەهێناوە،

لەکاتێکدا ناکرێ بوترێت نەیبیستووە، چونکە زۆربەی ڕیواتەکان دەچنەوە سەر (عیکرمە) کە زۆرێک لە زانایانی وەک (موسلیم، عطاء، سەعیدی کوڕی موسەییەب، موحەممەدی کوڕی سیرین و .....) فەرموودەیان لێوە ڕیوایەت نەکردووە و ڕرەتیان کردۆتەوە، ئینجا لە زۆرێک لە ڕیواتەکاندا وێنایەکی زۆر ناشیرین بۆ ئیمامی عەلی کراوە، چونکە ئیمامی عەلی بەردەوام لە ملاملێنی و جەنگدا بووە لە گەڵ موعاوییە و خەواریجەکان و ....، بۆیە دوور نییە چەندان شتی بۆ هەڵبەسترابێت بۆ لەکەدارکردن و ناشیرین کردنی.

بەڵام ئەگەر تەواو تەواو تەسلیمی فەرموودەکە بین، لێکدانەوەمان دەست دەکەوێت بۆ فەرموودەکە، چونکە لە چەندین ڕیوایەتی جۆراوجۆردا هاتووە کە ئیمامی (عەلی) یان بە خوا داناوە، دەی دەبێ چ فەسادێک لەوە گەورەتر بێت کە کەسێک بکەی بە خوا؟ وە مادام سوتاندن بەس مافی خودا بێت، عەلیش خودا بێت، ئێ کەوایە مافی سوتاندنی هەیە و سوتاندنەکەی پڕ بە پێستی خۆیان بووە!!!

کەواتە لەم فەرموودەیەدا دوو شتی گرینگ هەیە:

١- ئیمامی عەلی کە ئەو زەندیقانەی کوشتن لەبەر ئەوە بووە کە کۆمەڵێکی خراپ و فاسید بوونە و ویستوویانە دین و کۆمەڵگە تێکبدەن و بیشوێنن، چونکە هەر یەک کەس دوو کەس نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێکی زۆربوونە، ئینجا ئەو بڕیار و حوکمەی ئیمامی عەلی بەسیفەتی ئیمامەت و سەرکردایەتی بووە و ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتی کردووە.

٢- ئبین و عەبباس دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت: « مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ » واتە: هەرکەسێک دینی گۆڕی بیکوژن. ئەوەشیان وەک باسمان کرد بەپێی هەموو ئایەت و فەرموودەکانی تر تایبەت دەکرێت

و مەبەست لێی ئەو هەڵگەڕاوەیەیە کە لەگەڵ هەڵگەڕانەوەکەدا شەڕ و کودەتا و ... دەکات.

کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت هیچ فەرموودەیەکی سەحیحی سەریح نییە کە بڵێت: دەبێ هەڵگەڕاوەی ئاشتیخواز بکوژرێت. ئەوەی هەیە یان سەحیحە و سەریح نییە و مەبەستی هەڵگەڕاوەی شەڕکەر و ئاژاوەگێر و کودەتا کەرە، یان سەحیح نییە و فەرموودەی لاوازە.

بۆیە لەکۆتاییدا ئەگەر بمانەوێت سەدان ئایەت و دەیان فەرموودە و سیرەی جوانی پێغەمبەر (ﷺ) و یاسا گشتییەکانی ئیسلام و مەقاسیدی شەریعە و ڕووحی ئیسلام بپارێزین دەبێ ببێین ئەم چەند فەرموودە گشتیانە ڕاڤە بکەین لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودەکانی تر، کە ئەمەش تەواو تەواو یەکانگیرە و لەگەڵ قورئان و سوننە و سیرە و مەقاسیدی شەریعە و یاساکانی ئوسوڵی فیقە.

## ئایا کۆدەنگی هەیە لەسەر کوشتنی هەڵگەڕاوە؟

لە قورئان و سوننەت دا بەڵگەمان دەست نەکەوت بۆ کوشتنی مورتەدد، بەڵام لایەنگرانی بۆچوونی کوشتنی مورتەد پەنایان بۆ ئیجماع بردووە، بۆئەوەی بیسەلمێنن کە مورتەد دەکوژرێت، وە ئەگەر ئیجماع هەبێت نابێ لێی لابدەین، وە هەر کەس لە ئیجماع دەربچێت لاڕێ و گومڕایە، دوور نییە تەکفیرییەکان خوێنی حەڵاڵ بکەن چونکە کەسەکە لە ئیجماع لای داوە!

### پێناسەی ئیجماع (تعريف الاجماع)

**١.** وهو اتفاق مجتهدى الامة بعد وفاة محمد (صلى الله عليه وسلم)، فى عصر،على أى أمر كان.[١]

**٢.** الاجماع هو عبارة عن اتفاق امة محمد خاصة على أمر من الامور الدينية.[٢]

**٣.** اتفاق المجتهدين من أمة محمد بعد وفاته، في عصر من العصور، على أمر ديني.[٣]

**٤.** اتفاق مجتهدي العصر.من أمة محمد،بعد وفاته، على أي أمر كان من أمور الدين.[٤]

---

(١) الغيث الهامع شرح جمع الجوامع.

(٢) الإحكام في أصول الاحكام للآمدي.

(٣) اصول الفقه على منهج أهل السنة وليد بن راشد السعيدان.

(٤) عبد الكريم النملة.

**٥.** فهو اتفاق مجتهدي أمة محمد، بعد وفاته، في عصر من الاعصار على أمر من أمور الدين.[١]

**٦.** اتفاق مجتهدى الامة الاسلامية العدول، فى عصر بعد وفاة النبى (ﷺ) على حكم شرعى لسند.

بەپێی ئەم پێناسانە ئیجماع سێ یان چوار پایەی هەیە، چونکە باسی سەندیش هاتە ناوی، واتە:

دەبێ پشت ببەستێ بە دەلیلی قورئان یان سونەت.

**یەکەم:** کۆ دەنگی زانایانی ئوممەتی ئیسلامی.

**دووەم:** لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام).

**سێیەم:** لەسەر بابەتێکی شەرعی و دینی.

ئەگەر پرسیار لە خۆمان بکەین ئایا کۆدەنگی زانایان لە هەموو ئوممەتی ئیسلامی کەیی و لە چ وەختێک هاتۆتە دی؟

من دەڵێم بەم پێناسەیە هەتا ئێستا ئیجماعێک نابینی لەسەردەمی هاوەڵانەوە هەتا ئیستا، زانایان هەموو یەکدەنگ بن لە سەری بێجگە لە بابەتە یەکلابووەکان لە قورئان لە سونەتدا، وەک فەرزی نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات... وە حەرامی شیرک، درۆ، زینا، کوشتنی نابەهەق... ئەوانە پێویستیان بە کۆدەنگی نییە، بۆ؟

**١.** ئەو شتانە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) یەکلا بوونەوە بە قورئان، یان بە سوننەت.

---

(١) الاجماع عند الامام الشوكاني. عارف محمد بحيج المرادي.

**٢.** لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئیجماع سوودی نییە، چونکە ئەگەر موافقی قورئان و سونەت بێت ئیعتیبار بۆ قورئان و سونەتە نەوەک بۆ ئیجماع، وە ئەگەر ئیجماع پێچەوانەی قورئان سونەت بێ حیسابی بۆ ناکرێت و کۆدەنگی درووست نابێت.

**٣.** لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پەرت بوون بە دونیادا، هیچ کات نەکراوە ئەوان بۆ بابەتێکی تازە کۆببنەوە و هەموو یەک دەنگ بن، ئەم کارە لە ئێستاشدا ناکرێ بەو هەموو تەکنەلۆجیا پێشکەوتووەی کە لەبەر دەستدایە، چ جای ئەو کات کە بەس بەینی مەککە و مەدینە ٥٠٠ کیلۆ مەترە بێجگە لە وڵاتان و شوێنە دوورە دەستەکان.

**٤.** ئەوەی کە پێی وتراوە ئیجماع زۆرجار ئیجماعی ئەهلی مەدینە بووە، خۆ ئەگەر ئیجماع بریتی بێت لە کۆدەنگی زانایانی مەدینە یان مەککە دەبێ پێناسەکە لە ڕیشەوە بگۆردرێت دەنا هەموو پێناسەکان هەڵە دەردەچن، هەیە لە زانایان یەک دەنگی چوار مەزهەبەکەشی بە ئیجماع زانیوە و حیسابی بۆ مەزهەبەکانی تر نەکردووە.

**٥.** هەندێکیان زۆر جار وتویانە: نەمان زانیوە خیلافی ئەوە هەبێت، یان ئێمە زانیاریمان نییە کە خیلاف هەبێت، هێشتا ئەوە زۆر باشترە.

**٦.** یان ئیجماعەکەی ئەوان باسی دەکەن ئیجماعێکی سکوتی یە (الاجماع السکوتی) وە ئیجماعی سکوتی ئەو ئیجماعە نییە کە لە پێناسەکاندا هاتووە، چونکە ئەگەر فەتوایەک دراو و ئەوانی تر بێدەنگ بوون زۆر هۆکار هەیە بۆ بێدەنگی زانایانی تر:

- لەوانەیە بابەتەکەیان هەر پێ نەگەیشتبێ بۆیە قسەیان نییە لەسەری.

- یان هێشتا بەلای ئەوانەوە شتەکە تەواو یەکلا نەبۆتەوە و دیراسە نەکراوە.
- بابەتەکە زۆر درەنگ بە دەستیان گەیشتووە.
- یان نەوێراون لەبەر دەسەڵات و سوڵتە بۆچوونی خۆیان بڵێن.
- یان جاری وایە فتواکەیان بە هەڵە نەقڵ کراوە.

دەشگونجێ بە بابەتەکە ڕازی بووبن و هەمان بۆچونیان هەبێت، واتە ئەگەر زانایان هەموویان بەو شێوەیە ئەوانەی ئامادەی شوێنی ڕووداوەکە و حوکمەکە نەبن، ئەگەر هەموویان ڕازی بن _ کەواش نییە _ چونکە ئەو هەموو ئەگەرانە هەن کە باسمانکردن ( وإذا ثبت الاحتمال بطل الاستدلال) ئەوکات پێی دەڵێن: کۆدەنگی بێ دەنگی ( الاجماع السکوتی ) ئایا ئیجماعی سکوتی دەبێتە بەڵگە؟ بێگومان نەخێر چونکە ( لا ینسب إلی ساکت قول).

### پووختەی بۆچوونی ئیمامی شەوکانی:

- منع إمکانە، کەواتە کۆدەنگی مومکین نییە.
- منع وقوعە، واتە نەشبووە.
- منع إمکان نقلە، ئەگەر هەشبێ ناکرێ ئەو کۆدەنگییە نەقڵ بکرێت.
- منع وقوع نقلە، بەواقعی ڕووی نەداوە و نەقڵ کرابێ.[١]

لەراستیدا پووختەی وتەکانی شەوکانی زۆر جوان و وردە، بابەتە یەکلاکراوەکان لە بنچینەکانی ئیمان و ئیسلام ئەوەندەی بەڵگە لەسەرە ئیجاعی ناوێت، بابەتە زەنییەکان ئیجماعی لەسەر دروست نەبووە بە پێی

---

(١) الاجماع عند الامام الشوکانی.

پێناسەی زانایانی ئوصول، دەتوانین بڵێین نەمانزانیوە ڕای جیاواز هەبێ، دەنا ئەگەر بڵێی ئیجماع مولزەم دەبێت، ناوی زانایەکان و فەتواکەیان و شوێنی ڕووداوەکە و خودی ڕووداوە کەش و شێوازی کۆ دەنگییەکەش نەقڵ بکەی، بەمەرجێ لە هیچ وڵاتێ کەس موخالیفی نەبێت، هەمووش بینیبیان، هەمووش بۆیان گونجاو بێت دیراسەی بکەن و هیچ ڕێگرییەکیش نەبووبێ لە کەمی کات و هەڕەشە و سەرچاوە و.... .

جا نازانم ئیجماع ی وامان هەیە یان نا!؟ وە ئیمامی (جووەینی) ش سەبارەت بەم بابەتە هەمان بۆچوونی هەیە، کە جیاوازی لە نێوان شتە قەتعییەکان و زەنیەکاندا دەکات.[١]

---

(١) البرهان للجويني.

## ئایا ئیجماع لەسەر کوشتنی هەڵگەڕاوە هەیە؟

١. ئیجماع دەبێ بەڵگەی لەسەر بێ لە بابەتی دینی، لەکاتێکدا قورئان پڕیەتی لە باسی ئازادی بیروباوەڕ بە زیاتر لەسەد ئایەت ئایا چۆن دەکرێ ئیجماع دژی قورئان بێ.

٢. قورئان باسی مورتەدی کردووە بە زیاتر لە چواردە ئایەت بەڵام باسی کوشتنی نەکردووە.

٣. قورئان باسی شتی زۆر ئەهوەنتر و ئاسانتری کردووە بۆچی باسی کوشتنی مورتەدی نەکردووە لەکاتێکدا پەیوەستە بەگیانی هەزاران مرۆڤەوە؟

٤. ئەسڵ لە خوێنی ئینساندا پارێزرانە بە کافر و مسوڵمانەوە، بۆیە بەبەڵگەی ڕوون نەبێ نابێ خوێنی مرۆڤ برێژرێ.

٥. کافر لەبەر کافربوون ناکوژرێ، ئەگەر وابێ دروست نییە هاوپەیمانیان بی و خواردنیان بخۆیی و ژنیان مارەکەی لە کاتێکدا دەڵێت: عیسا کوری خوایە و شەریکی خوایە، بەڵکو لەبەر ئەوەی بۆتە ئەهلی شەڕ واتە (محارب) جەنگاوەر دژی مسوڵمانان بۆیە دەکوژرێ، خۆ ئەگەر مسوڵمانیش وابکا یان چەتەیی بکا یان ستەم بکا یان یەکێ بەناهەق بکوژێ هەر دەکوژرێت، بە بەڵگەی ئایەتی: وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾

ئەی هۆشمەندەکان ژیانتان تەنها لە تۆڵەسەندنەوەدایە (لەو کەسانەی خەڵکی بەناحەق دەکوژن)، بۆ ئەوەی تەقواو لە خوا ترسان ببێتە پیشەتان و خۆ لە دەستدرێژی و تاوان بە دوور بگرن.

إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾.

وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٩﴾

ئەگەر دوو کۆمەڵ لە ئیمانداران دژ بەیەکتر جەنگیان کرد ئەوە لە نێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن ئینجا ئەگەر کۆمەڵێکیان دەست درێژی کرد بۆ سەر کۆمەڵێکی تریان ئەوە ئێوە (موسوڵمانان) لەگەڵ ئەوەیان بجەنگن دەست درێژی دەکات تا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا (ملکەچی فەرمانی دەبێ) ئینجا ئەگەر گەڕایەوە ئەوسا لە نێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن بە دادگەرانە و ڕاست و دادپەروەر بن (لە نێوانیاندا) بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ.

**٦.** بابەتی مورتەد لە سونەت دا هەردوو لای هەیە بەشێکی موافیقی قورئانە کە زۆرینەی سونەت و سیرەتی پێغەمبەرە علیه الصلاة والسلام، وە بەشێکی وادەردەکەوێ کە موخالیفی قورئانە بەڵام ئەوە وانییە، چونکە لە فەرموودەکان بە ڕوونی باس کراوە ئەوانە دەکوژرێن کە محارب و جەنگاوەرن یان چەتەو ڕێگرن، یان کودەتا چین، یان فەساد و ئاشوبیان ناوەتەوە.

**٧.** وەکەسی موونافیق زۆر لە مورتەد مەترسیدارترە بۆچی ئەو گیانی پارێزراوە بەڵام کەسێک درۆت لەگەڵ ناکات گیانی پارێزراو نیە!

**٨.** ئەوانەی باسی ئیجماعیان کردووە، وتەکەیان پێچەوانەی قورئان و سونەتە، لە قورئان و سونەتدا کێشە نییە، حوکمەکە ڕوونە بەڵام لە نەقڵ کردن و ناونانی بە ئیجماع کێشە هەیە، واتە هاوەڵان نەیان وتووە ئێمە کۆدەنگین، یان تابیعی نەیان وتووە ئێمە یەک دەنگین لەسەر کوشتنی مورتەد، ئەگەر ئەوە هەیە با کەسێک نیشانمان بدات بە بەڵگەی درووست و ڕاشکاو، بۆیە ڕەفتاری هاوەڵان کە مانای جۆراوجۆر هەڵدەگرێت چۆن دەبێ ناو بنرێ کۆدەنگ؟!

**٩.** ئەگەر بڵێین ئەوانەش هەموو قەیناکا، ئایا فیعلەن بە واقیعی ئیجماع هەبووە ؟

حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَجُلٌ مِنْ قِبَلِ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ، فَسَأَلَهُ عَنِ النَّاسِ ؟ فَأَخْبَرَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ عُمَرُ: هَلْ كَانَ فِيكُمْ مِنْ مُغَرِّبَةِ خَبَرٍ ؟ فَقَالَ: نَعَمْ. رَجُلٌ كَفَرَ بَعْدَ إِسْلَامِهِ، قَالَ: فَمَا فَعَلْتُمْ بِهِ ؟ قَالَ: قَرَّبْنَاهُ، فَضَرَبْنَا عُنُقَهُ. فَقَالَ عُمَرُ: أَفَلَا حَبَسْتُمُوهُ ثَلَاثًا ؟ وَأَطْعَمْتُمُوهُ كُلَّ يَوْمٍ رَغِيفًا، وَاسْتَتَبْتُمُوهُ لَعَلَّهُ يَتُوبُ وَيُرَاجِعُ أَمْرَ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: اللَّهُمَّ إِنِّي لَمْ أَحْضُرْ، وَلَمْ آمُرْ، وَلَمْ أَرْضَ إِذْ بَلَغَنِي. موطأ ٢١٥٢.

ئەو پیاوەی کە لەلای ئەبو موسای ئەشعەریەوە هاتبوو بۆ لای عومەر و ئەویش پرسیاری لێکرد چ شتێکی نامۆ و نەبیستراو ڕووی داوە، ئەویش باسی ئەو پیاوەی کرد کە مسوڵمان بوو و هەڵگەڕایەوە، ئەویش فەرمووی: بۆ زیندانیتان نەدەکرد سێ ڕۆژان، هەر ڕۆژەی کولێرەیەکتان دابایە بەڵکو تەوبە دەکا ....

وە ئیمامی شافیعی هەمان ڕووداوی هێناوە، کەواتە ئیمامی عومەر ڕای جیاواز بووە لەسەر کوشتنی هەڵگەڕاوە و لەگەڵ زیندانی کردندا

بووە، جا چەند زیندانی بکرێ؟ ڕۆژێک یان مانگێک یان سێ مانگ، یان تا دەمرێ هەموو بۆچوونەکان هەن ..... بەڵام ئەم ئیجتیهادەی ئیمامی عومەریش دوبارە دەچێتە چوارچێوەی سیاسەی شەرعییەوە و یاسایەکی گشتی نییە، واتە ناکرێ بوترێ: دەبێ هەموو هەڵگەڕاوەیەک زیندانی بکرێت، چونکە ئەمەش دووبارە بەڵگەی لەسەر نییە. بەڵام کارەکەی ئەو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوشتنی هەڵگەڕاوەی ئاشتیخواز هیچ بەڵگەیەکی لە قورئان و سوننە و ئیجماع لەسەر نییە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کتێبەکانی فیقهی و شەرحی حەدیس، بە ڕوونی جیاوازی لە نێوان زانایاندا دەبینین لەم بابەتانە:

• جیاوازی هاوەڵان لەسەر کوشتنی مورتەد لەوانە عومەر ڕەزای خوای لێ بێ، بە ئامادەبوونی هاوەڵان داوای کردووە کە دەبوو داوای تەوبەیان لێکردبا و ڕۆژانە خواردنیان پێدابا.

• بەشێک لە تابیعی لە گەڵ کوشتنی مورتەد نەبوون وەک ئیبراهیمی نەخەعی بەڵکو لەگەڵ تەوبە پێ کردن دابووە.

• ئەبو حەنیفە ئافرەتی مورتەد ناکوژێ.

• لای شافیعیەکان و حەنبەلیەکان داوای تەوبەی لێدەکرێ، لە کاتێکدا لەو فەرموودانەی کە ئەوان بەبەڵگەیان هێناونەوە باسی تەوبە نەکراوە.

• باسی استتابة (داوای تەوبە کردن لەکەسی هەڵگەراوە) لە فەرموودە صەحیحەکاندا نەهاتووە، زیاتر فەقیهەکان و فەرموودەناسەکان وەک ناونیشان بۆ هەندێک فەرموودەکان دایان ناوە، وەک ئەو فەرموودەیە:
حَدَّثَنَا عَبَّادُ بْنُ مُوسَى الْخُتُّلِيُّ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ الْمَدَنِيُّ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ عُثْمَانَ الشَّحَّامِ، عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ، أَنَّ أَعْمَى كَانَتْ لَهُ أُمُّ وَلَدٍ

تَشْتُمُ النَّبِيَّ صَلىَّ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَقَعُ فِيهِ، فَيَنْهَاهَا فَلاَ تَنْتَهِي، وَيَزْجُرُهَا فَلاَ تَنْزَجِرُ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَتْ ذَاتَ لَيْلَةٍ جَعَلَتْ تَقَعُ فِي النَّبِيِّ صَلىَّ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَشْتُمُهُ، فَأَخَذَ الْمِغْوَلَ فَوَضَعَهُ فِي بَطْنِهَا وَاتَّكَأَ عَلَيْهَا فَقَتَلَهَا، فَوَقَعَ بَيْنَ رِجْلَيْهَا طِفْلٌ فَلَطَّخَتْ مَا هُنَاكَ بِالدَّمِ، فَلَمَّا أَصْبَحَ ذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلىَّ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَمَعَ النَّاسَ فَقَالَ: « أَنْشُدُ اللَّهَ رَجُلاً فَعَلَ مَا فَعَلَ لِي عَلَيْهِ حَقٌّ إِلَّا قَامَ ». فَقَامَ الْأَعْمَى يَتَخَطَّى النَّاسَ وَهُوَ يَتَزَلْزَلُ حَتَّى قَعَدَ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ صَلىَّ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا صَاحِبُهَا ؛ كَانَتْ تَشْتُمُكَ وَتَقَعُ فِيكَ، فَأَنْهَاهَا فَلاَ تَنْتَهِي، وَأَزْجُرُهَا فَلاَ تَنْزَجِرُ، وَلِي مِنْهَا ابْنَانِ مِثْلُ اللُّؤْلُؤَتَيْنِ، وَكَانَتْ بِي رَفِيقَةً، فَلَمَّا كَانَ الْبَارِحَةَ جَعَلَتْ تَشْتُمُكَ وَتَقَعُ فِيكَ، فَأَخَذْتُ الْمِغْوَلَ فَوَضَعْتُهُ فِي بَطْنِهَا وَاتَّكَأْتُ عَلَيْهَا حَتَّى قَتَلْتُهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلىَّ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « أَلَا اشْهَدُوا أَنَّ دَمَهَا هَدَرٌ ». رواه ابوداود ٤٣٦١ ورواه النسائي برقم ٤٠٧٠.

ئەم فەرموودەیە هاتووە کە زانایان دەیکەنە بەڵگە بۆ (استتابة)، ئەگەر فەرموودەکە کێشەی نەبا لە ڕوی صیحەتەوە دەکرا بکرابا بەڵگە، بەڵام حوکمی شەرعی دەبێ لەسەر بەڵگەی بە هێز دابمەزرێ، وە ئەگەر کێشەشی نەبێ ـ کە هەیەتی ـ چونکە فەرموودەکە دەچێتەوە سەر عیکرەمە، عیکرەمەش بە فیکر لەگەڵ بۆچونی خەواریجەکاندا بووە کە کوشتنە بە کەمترین هۆ، ئەوە ناکرێ بکرێتە بنەمایەکی وا کە ئەو هەموو زانایانە بیکەنە پێوەری مامەڵە کردن لەگەڵ مورتەد، چونکە مورتەد ئەگەر نەبێتە چەتە و مافیا و کودەتا چی، ناکوژرێ، وەک قورئان و سوننەتی صەحیح باسی دەکەن، ئەگەر واش بوو ئەوە دەکوژرێت، خوای گەورەش باسی چەتە گەری و ئیفسادی کردووە لە گەڵ کوشتنی بە ناهەق بۆ ئەوەی ببێتە هۆکاری کوژران.

## بۆچی زانایان ئاوا یەکدەنگ دەردەکەون لەسەر کوشتنی مورتەد؟

**١.** لەبەر متمانە بوونی لە ڕادەبەدەر بە فەموودەکەی (من بدل دینه فاقتلوه)، و نەگەڕانەوە بۆ کۆی گشتی فەرموودەکان و قورئان و سیرەی پێغەمبەر (ﷺ) و یاسا ئوسوڵییەکان.

**٢.** ویست و حەزی دەسەڵاتی سیاسی بۆ سەرکووت کردنی نەیارەکانیان بە بیانووی هەڵگەرانەوە لە دین یان لە دەسەڵاتی سیاسی.

**٣.** بۆ ڕێگری کردن لە لەبەریەکهەڵوەشانی کۆمەڵگەی موسڵمانان و دزەکردنی ناموسڵمانان بۆ ناو ئیسلام و موسڵمانان بە ناڕاستگۆیی و دوایی هەڵگەڕانەوەیان و لە دژ وەستانی موسڵمانان، چونکە موسڵمانان سەردەمانێکی زۆر لە ململانێدا بوون بەرامبەر شارستانییەکانی تردا.

**٤.** ڕاڤەکردنی کرداری سەحابی بە ئیجماع، کە ئەمە لە خۆیدا هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت شتی ڕاجیاییان زۆر بووە.

**٥.** شلگیری (التساهل) لە بابەتی ئیجماعدا و تێنەگەیشتن و جێبەجێنەکردنی وەک خۆی، بۆیە دەبینین زۆرجار فەتواکان ناو نراون بە ئیجماع بەبێ ئەوەی مەرج و پێناسەی ئیجماعیان بەسەردا ببڕێت.

## هەڵگەڕانەوەی توند و هەڵگەڕانەوەی ناتووند، یان هەڵگەڕانەوەی بچووک و گەورە (ردة مُغَلَّظَة وغير مغلظة)

ئەم دابەشکردنەش هەیە بۆ هەڵگەڕانەوە، هەندێک پێیان وایە لەسەر هەڵگەڕانەوەی گەورە دەکوژرێ بە بێ ئەوەی داوای تەوبەی لێبکرێت، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە خوای گەورە دەرگای تەوبە لەکەس داناخا، بەڵام تەوبە مەرجی خۆی هەیە، کەسێک خوێنی کەسێکی ڕشتبێت یان ئەندامێکی لێکردبێتەوە، یان ماڵێکی داگیر کردبێ، دەبێ تۆڵەی لێ بکرێتەوە، دەنا کێ لە فیرعەون کافرتر بوو؟! هێشتا خوای گەورە بە موسا و هارون دەفەرموێت: (فقولا له قولا لينا) واتە: بەنەرمی و جوانی لەگەڵی بدوێن و گفتووگۆی لەگەڵدا بکەن، پاشان ئەم ئایەتەی دەفەرموێت: (إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴿١٣٧﴾) النساء. بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دوایی پاشگەز بوونەتەوە، دووبارە ئیمانیان هێنایەوە و دوایی پاشگەز بوونەوە، لەوەودوا زیاتر لە بێ دینی و کافریدا ڕۆچوون، هیچ کات خوا لەوانە خۆشنابێت و ڕێنموویيان ناکات بۆ ڕێبازێکی سوود بەخش.

ئەم ئایەتە باسی هەڵگەرانەوەی گەورەیە، ئایا لەوە خراپتر هەیە کە سێک سێ جار کافر بێ؟! بەڵام حوکمی کوشتنی بۆنەداوە.

یان ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ

﴿٧٢﴾ آل عمران. دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) وتیان بە تاقمێکیان: ئێوە لە سەرەتای ڕۆژدا (بەدرۆوە) ئیمان و باوەڕ بهێنن بەو (قورئانەی) بۆ ئیمانداران ڕەوانە کراوە، بەڵام لەکۆتایی ڕۆژداو دەمە و ئێوارە پەشیمان ببنەوە (تا دوودڵی و گومانیان تێدا درووست ببێت) بۆ ئەوەی پاشگەز ببنەوە.

ئایا لەوە خەراپتر هەیە کەسێک بەیانیان ئیمان بێنێ و ئێواران هەڵگەڕێتەوە؟! بەڵام حوکمی کوشتنی بۆدانەناوە.

بۆیە من ئەوە دووبارە دەکەمەوە کە بابەتی هەڵگەڕانەوە دەچێتە پاڵ بابەتی سیاسەی شەرعی، سەکردەی مسوڵمانان چی پێ چاک بوو ئەوە جێبەجێ دەکات، بەڵام دەبێ وریا بین ئەم بابەتە لەمرۆدا ڕەها نییە، دەبێ ئەم بابەتە گرنگە لە دەستوردا یەکلایی بکرێتەوە دەنا وەک زۆر لە خەلیفە و کاربەدەستە ستەم کارەکان ئەم بابەتە بەکار دێنن بۆ لەناوبردنی نەیارەکانیان.

## حوکمی گاڵتە و سوکایەتی بە پیرۆزییەکان

**ئایا حوکمی ئەو کەسە چیە کە سوکایەتی بە پیرۆزییەکان دەکات؟**

بۆ وەڵامی ئەم پرسارە با بگەڕێینەوە بۆ قورئانی پیرۆز و سوننەت و سیرەی رەسول الله (صلى الله عليه وسلم).

**١.** بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی وەک قورئان بۆمان تۆمار دەکات بێباوەڕان گاڵتەیان بە دین کردووە و دەیان ناو و ناتۆرەیان لە پێغەمبەرانی خوا ناوە (سەلامی خوایان لەسەر بێت).

(وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنْهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ(الأنعام: ١٠). سوێند بێ بێگومان گاڵتە کراوە بە پێغەمبەرانی پێش تۆ سەرئەنجام بۆ ئەوانەیان گاڵتەیان دەکرد دابەزی و دەوری دان تۆڵەی ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد.

ئەم ئایەتە پێمان دەڵێ هیچ پێغەمبەرێک نییە گاڵتەی پێ نەکرابێ بەبێ ڕیزپەری (استثناء).

**٢.** خوای گەورە باسی ئەهلی کیتابمان بۆ دەکات، بەتایبەت جولەکەکان کە تەنانەت سوکایەتی و بێ ئەدەبییان بەرامبەر خوای گەورەش کردووە، (لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ (آل عمران: ١٨١). بەڕاستی خوا بیستی وتەی ئەو (جوولەک) انەی کە وتیان بێگومان خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین (چونکە داوای قەرزمان لێدەکات) ئەوەی کە وتیان دەینوسین (وە دەینوسین) کوشتنی ئەوانە

بۆ پێغەمبەرەکان بە نارەوا، وە (پێیان) دەڵێن بچەژن سزای ئاگری سوتێنەر.. .

جا سوکایەتی و بێ ئەدەبی لە وە خراپتر هەیە بڵێی خوا فەقیرە و ئێمە دەوڵەمەند و دەوڵەمەندترین لە خوا؟

**٣.** خوای گەورە دەربارەی یەهود دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ لْيَهُودُ يَدُ للَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ لْعَدَٰوَةَ وَلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ لْقِيَٰمَةِ كُلَّمَآ أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا للَّهُ وَيَسْعَوْنَ فِي لْأَرْضِ فَسَادًا وَللَّهُ لَا يُحِبُّ لْمُفْسِدِينَ﴾ (المائدة: ٦٤).
ئەو جولەکە (نەفام و خوانەناسانە) دەیانوت: خوا دەستی دەستی بەستراوە و خێری لەدەست نابێتەوە!! دەک دەستیان بەستراو و بێ خێرو کەلەپچە و تووشی شەلەل بێت، دەک نەفرینیان لێ بێت، بۆ خۆیان و قسەیان، نەخێر، وانیە بەڵکو دوو دەستەی (پڕ لە بەرەکەتی پەروەردگار) هەمیشە و بەردەوام کراوەیە، چۆنی بوێت و چەندی بوێت دەیبەخشێت! سوێند بێت زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆت کە قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە یاخی بوون و ستەمیان زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لە کوفردا، ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان لەنێوانیاندا بەرپاکردووە، هەر کاتێک دەیانەوێت جەنگ بەرپا بکەن و ئاگری شەڕ هەڵبگیرسێنن خوا دەیکوژێنێتەوە و نایەڵێت تەشەنە بکات، ئەوانە زۆر بەپەلە و بەگەرمی هەوڵی بڵاو بوونەوەی فەسادو تاوان دەدەن لە زەویدا، خوایش ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن ....

دەبینین خوای گەورە باسی بێ ئەدەبی یەهودمان بۆ دەکا دەربارەی خوای گەورە، بەڵام باس لەوە ناکات کە پێغەمبەر سزایان بدا و بیان کوژێت لەسەر ئەم سوکایەتییە.

**٤.** خوای گەورە دەربارەی مونافیقەکان لە سورەتی (التوبة) لە غەزوەی تەبوک دەفەرمویێت: (وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ (التوبة: ٦٥). ئەگەر لێیان بپرسیت: سەبارەت بە گاڵتە کردن بەخواو ئایەتەکانی و پێغەمبەری خوا، ئەڵێن: بەڕاستمان نەبووە، بەڵکو تەنها گاڵتە و گەپمان دەکرد. (قەتادە) دەڵێت: لەو دەمەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) سەرقاڵی غەزای (تەبووک) بوو، چەند سوارێک لە دووڕووەکان بەبەردەمیا تێپەڕین و گوتیان: زۆر سەیرە! ئەم پیاوە پێی وایە کە کۆشک و قەڵای ڕۆمەکان دەگرێ؟! های های لەوە! پاشان ئەم قسەیە بە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتەوە، ئەویش بانگی کردن و گوتیان: سوێندبێ بەگاڵتەوە گوتومانە، ئەوسا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: {قل أبالله وآياته ورسوله كنتم تستهزؤن} پێیان بڵێ: ئایا گاڵتەتان بەخوا و ئایەتەکانی و، بەپێغەمبەرەکەی کردبوو؟ واتە: هەر وتەیەکی کوفر و ناشیرین و ناقۆڵا لەدەم دەرچێت، بێگومان مرۆڤی پێ کافر دەبێت، ئەو مونافیقانە لە ڕواڵەتدا مسوڵمان بوون، بەڵام گومان لەوەدا نییە بەم کارەیان کافر بوون، واتە هەڵگەڕاونەوە، بەڵام کوا سزاکەیان، ئایەتەکانی دواتر ڕوونی دەکەنەوە وەک دەفەرموێ: (لَا تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ (التوبة: ٦٦). (ئیتر بێ سوودە پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر لە دەستەیەکتان خۆش ببین (دوای تەوبەی ڕاستەقینە) دەستەیەکتان هەر ئازار دەدەین (بەهۆی کاری

نابەجێیەوە) چونکە بەڕاستی ئەوان تاوانبار و تاوانکار بوون. دواتریش دەفەرمویَ: (ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ (التوبة: ٦٧). وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا هِىَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ (التوبة: ٦٨). خوا (هەڕەشەی کردوە و) بەڵێنی ئاگری دۆزەخی بە دووڕووەکان لە پیاوان و ژنان و بەبێ باوەڕانیش داوە، کە بەردەوام و نەمرن تیایدا، ئەو دۆزەخەیان بەسە و کاڵا بەقەد باڵایەو خوا نەفرەتی لێکردوون و سزای بەردەوامیش بەشیانە و بۆیان ئامادەیە.

بۆیە دەبینین ئەوان کافر بوون و گاڵتەیان بە خوا و پێغەمبەر و ئایەتەکانی خوا کردووە، بەڵام کوا سزاکەیان، وە ئایا پێغەمبەری خوا چ سزایەکی ئەوانی دا؟

**٥.** خوای گەورە دەربارەی گاڵتە کردن بە ئایەت و کافربوون پێی ڕێنماییمان دەکات، کە چ بکەین، وەک دەفەرمویَ: (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا (النساء: ١٤٠). بەڕاستی (خوای گەورە) لە قورئاندا ئەم بڕیارەی ناردووە بۆ سەرتان کە: هەر کاتێک لە جێیەکدا گوێتان لێ بوو کوفرو گاڵتە بەئایەتەکانی خوا دەکرا، ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانەدا هەتا قسەو باسەکەیان بەگۆڕن (ئەگەر دابنیشن و گوێ نەدەنێ) ئەوە بەڕاستی ئێوەش لەو کاتەدا وەک ئەوانن و (حسابی ئەوانتان بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا دووڕووەکان و بێ باوەڕەکان هەموویان لە دۆزەخدا کۆدەکاتەوە. ڕێنمای خوای گەورە لەکاتی گاڵتە

کردن بە ئایەتەکانی خوا ئەوەیە کە لەگەڵیان دانەنیشین یان ڕەدیان دەینەوە، دەنا وەک ئەوان ئێمەش کافر دەبین و دەبینە ئەهلی ئاگر.

٦. خوای گەورە دەربارەی سەرۆکی مونافیقەکان دەفەرموێت: (يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ (المنافقون: ٨). دووڕووەکان (واتە:عەبدوڵڵا و شاگردەکانی) دەڵێن: سوێند بێ بە خوا، ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینەو، لەم جەنگەی (بەنی مصطلق) ڕزگارمان بوو {ليخرجن الأعز منها الأذل} دەبێ دەسەڵاتدار و بەڕێز، واتە: ئەوان، خەڵکە زەلیلەکەی لێدەرکەن، واتە: پێغەمبەر و هاوەڵانی لە مەدینە وەدەرنێن! جا کە کوڕەکەی (سەلوول) ئەوەی گوت: کوڕەکەی خۆی - (عەبدوڵڵا) کە موسڵمانێکی دڵسۆز بوو- چوو لەدەرگای (مەدینە)دا شیرەکەی بەدەستەوە گرت و وەستا، جاکاتێ دیتی وا باوکی هات، چووەپێش و پێی گوت: بگەڕێوە دواوە، ئەمەش سوێند بێت تانەڵێیت پەیامبەر عەزیز و سەربەرزە! ئێمە زەلیل و پەست و ریسواین، نابێ بڕۆیتە نێوشارەوە، ئەویش بەناچاری پێی لێناو، ئەویش ڕێگەی بۆکردەوە بۆ ناوشار، پاشان عەبدوڵڵا هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: بیستوومە کە ئەتەوێ ئەی پێغەمبەری خوا! باوکم بکوژی، جا ئەگەر نیازێکی وات هەیە و ڕاستە، فەرمان بدە بامن خۆم بیکوژم و هەرئێستایش کەلە سەرەکەیت بۆ دێنم! ئەویش فەرمووی: نا، نایکوژین {ولله العزة ولرسوله وللمؤمنين} ڕێز و عیزەت و گەورەیی هەر بۆ خواو بۆ پەیامبەرەکەی و بۆ باوەڕدارانە {ولكن المنافقين لا يعلمون} بەڵام دووڕووەکان نازانن، چونکە ڕێی ڕاستیان لێچەواشە بووە.

جا چ سوکایەتیەک لەوە خراپترە کە بە پێغەمبەر بڵێی زەلیل و زەبون، بەڵام پێغەمبەری خوا چی لێکردو چ سزایەکی دا؟ دیارە هیچ، بەڵکو فەرموی: ( بل نترفق به ونحسن صحبته ما بقی معنا) نەرم دەبین لەگەڵی و هاوڕێیەتی باش دەنوێنین لەگەڵیدا تا ئەوکاتەی لەگەڵمان بمێنێتەوە.

**٧.** پێغەمبەری خوا چەندین جار - وەک لە سوننەت و سیرە تۆمار کراوە - کە گوێی لە جولەکە و دووڕووەکان دەبوو گاڵتەیان پێدەکردوو توانجیان لێدەدا و سوکایەتییان پێدەکرد، بەڵام ئەو فەرمانی خوای جێ بەجێ دەکرد (فأعرض، واهجرهم هجرا جمیلا، فاصفح الصفحل الجمیل، واصبر صبرا جمیلا) وە ئەگەر پێویست بوو لەگەڵیان توند بێت، (واغلظ علیهم).

**٨.** دەبێ ئەوە بزانین کە بێ دینی لە سوکایەتی بەدەر نییە، کەسێک بڕوای بەخوا نەبێ سوکایەتی و بێ ئەدەبیش دەکات، بۆیە ئەمە لە دێر زەمانەوە هەتا ئێستاش و لە هەموو دینەکانیشدا هەبووە و دەشبێت.

**٩.** ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئێمە دەرگا بۆ بێ دینی و سوکایەتی دەکەینەوە وەک هەندێک وا گومان دەبەن و واش دەڵێن یان دەڵێن شل بونەوە و تەنازول دەکەن، یان بوونە ....، بەڵام چی دەڵێن با بیڵێن، مادام ناحەقی جوێن بە پێغەمبەران وتراوە بە ئێمەش دەوترێ.

**١٠.** ئاگاشمان لە ڕووداوەکانی سیرە هەیە کە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) فەرمانی کوشتنی بۆ هەندێک کەس دەرکردووە کە سوکایەتییان بە پێغەمبەر کردووە، بەڵام پێغەمبەری خوا پێچەوانەی قورئان ناجوڵێتەوە، وە قورئان بنچینە گشتییەکان دادەڕێژێت و ئەسڵ لە تەعامول لە گەڵ ئەو بابەتە گرنگەدا بریتییە لە قورئان و سوننەت و

سیرە بە گشتی، بۆیە ناکرێ لەبەر چەند ڕووداوێک کە هۆکاری خۆی هەبووە و لە کاتی تایبەت و بۆ کەسی تایبەت کراوە و جێبەجێ کراوە واز لە قورئان و سوننە و سیرە بێنین.

**١١.** دەبێ لە چوارچێوەی دەستور ڕێگە لەوە بگیرێ سوکایەتی بە پیرۆزییەکان بکرێت.

**١٢.** بەشێک لە زانایان زیادەڕەوی زۆریان لەو بابەتەدا کردووە و سزای زۆر قورسیان داناوە پاڵپشت بە چەند فەرمودەیەکی لاواز و ڕوداوی سیرە.

# ئازادی هەڵگەڕانەوە

**ئەو ئایەتانەی باسی (مرتد) هەڵگەڕاوە دەکەن:**

**١.** (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ) ﴿٥٤﴾ المائدة. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەر کەس لە ئێوە لە ئایین و بەرنامەکەی وەرگەڕێت و پاشگەز ببێتەوە، ئەوە (هەر خۆی زەرەر دەکات) ئەوە لە ئایندەدا خوا کەسانێک دەهێنێتە کایەوە (ئەوەندە ڕێک و پێک و باوەڕ دامەزراون) پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن، ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت، هەروەها ملکەچ و فەرمانبەردار و بەسۆزن بۆ ئیمانداران و سەربڵند و نەخۆر و دەروون بەرزن بەسەر بێ باوەڕاندا، لە پێناو ڕێبازی خواداو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو هەوڵ دەدەن و خەبات دەکەن و تێدەکۆشن، لە لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن (ئەم خۆشەویستی و هەڵبژاردن و سۆز و تێکۆشانە) فەزڵ و ڕێزی تایبەتی خوایە کە دەیبەخشێت بە هەر کەس کە بیەوێت و (شایستە بێت) و خوا فراوانگیر و زانایە (بەنهێنی و ئاشکرا، بەشایستەیی و ناشایستەیی هەر کەس و هەر لایەنێک).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا کە بەڕاشکاوی باسی هەڵگەڕاوە دەکا، باسی هیچ سزایەکی دونیایی لەگەڵدا نەکراوە بێجگە لە هەڕەشە کردن بە گۆڕین بە خەڵکانی تر کەوەک ئەوان نابن، بەڵکو ئازا و بوێر و تێکۆشەر دەبن، خوای گەورەیان خۆشدەوێت و خوای گەورەش ئەواونی خۆشدەوێت.

**٢.** (وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ) ﴿١٠٩﴾ البقرة. زۆرێک لە خاوەن کتێبەکان ئاواتە خوازن لەبەر حەسوودی و ناپاکی خۆیان ئەگەر بۆیان بکرێت بتانگێڕنەوە ڕیزی بێ باوەڕان ئەمەش دوای ئەوەی کە حەق و ڕاستییان بە تەواوی بۆ ڕوون بۆتەوە، بەڵام ئێوە هەر لێیان ببوورن و لێیان مەگرن و چاوپۆشییان لێ بکەن، تا خوا کاری خۆی ئەنجام دەدات و ویستی خۆی جێبەجێ دەکات، بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

خوای گەورە باسی هەوڵەکانی خاوەن نامەکان دەکات کە ئەوپەری هەوڵ دەدەن بۆ کافر کردنی مسوڵمانان، کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) و بڕواداران ئاگادارن لەو هەوڵانەی جولەکەکان، لەگەڵ ئەوەشدا دەفەرموێت: بیانبوورە، چاوپۆشییان لێبکە، لەدوای ئەوەی کە ڕاستیشیان بۆ ڕوون بۆتەوە، لێرەدا بە ڕوونی دیارە هیچ سزایەیەک نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە باسی لێبووردن و چاوپۆشی کراوە.

**٣.** (وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) ﴿٧٢﴾ آل عمران. دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) وتیان بە تاقمێکیان: ئێوە لەسەرەتای ڕۆژدا (بەدرۆوە) ئیمان و باوەڕ بهێنن بەو (قورئانەی) بۆ ئیمانداران ڕەوانە کراوە، بەڵام لەکۆتایی ڕۆژداو دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە (تا دوودڵی و گومانیان تێدا دروست ببێت) بۆ ئەوەی پاشگەز ببنەوە.

ئەم جۆرە پلانە دەچێتە بازنەی کوفری (مُغَلَّظ) چونکە پلانگێڕیەکە زۆر گەورەیە، کەسێک بە فێڵ بەیانی بڕوا بێنێت، بەڵام ئێوارە کافر

بێتەوە، ئەوە گەورەترین کودەتایە بەسەر مسوڵمانانداو، لەگەڵ ئەوەشدا باسی سزا لەئارادا نییە، لە ئایەتەکەی دواتر بە ڕوونی پلانەکە دیارە کە هەڵگێڕانەوەی مسوڵمانانە وەک دەفەرموێت: (وَلَا تُؤْمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤْتَىٰٓ أَحَدٌ مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ آل عمران. واتە: (هەروەها دەڵێن): بڕوا مەکەن و متمانە مەکەن بە کەس جگە بەو کەسانەی کە شوێنی ئایینی ئێوە کەوتوون! (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان) بڵێ: کە بەڕاستی هەر هیدایەت و ڕێنموویی خوایی هیدایەت و ڕێنمویی یە، (کەچی جووەکان بەیەکتر دەڵێن): دان بەوەدا مەنێن کەکەس وەکو ئێوەی پێبەخشراوە، باسی (تەورات و دواهەمین پێغەمبەریش مەکەن)!! تا لای پەروەردگارتان (سبەی لە قیامەتدا) قسەیان زاڵ نەبێت بەسەرتاندا!! (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) تۆش) بڵێ: بەڕاستی هەرچی ڕێز و بەخشش و فەزڵ هەیە بەدەست خوایە و دەیبەخشێت بەو کەسانەی کە دەیەوێت و (شایستەن) و خوا فراوانگیر و زانایە.

٤. (إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ) ﴿٢٥﴾ محمد. بەڕاستی ئەوانەی پاشگەز بوونەوەو بەرەودوا گەڕانەوە، دوای ئەوەی ڕێگەی هیدایەت و ئیمانیان بۆ دەرکەوتبوو، ئەوانە شەیتان بەفێڵ و تەڵەکە تەماداری کرد بوون، بەهیوای تەمەن درێژی و خۆشگوزەرانیش فریوی دەبوون.

(فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ) ﴿٢٧﴾ محمد. ئاخۆ حاڵیان چۆن بێت کە فریشتەکان لەکاتی گیان کێشانیاندا بەدەم و چاو و بەرەو پشتیاندا دەماڵن.

(ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٢٨) محمد. ئەو سووکایەتی سەرەمەرگە بۆیە بەسەریاندا دێت، چونکە ئەوانە شوێنی ئەو شتانە کەوتبوون کە قین و خەشمی خوا دەبزوێنێت، ئەوانە بێزار بوون لە ڕەزامەندی خوا، خوایش کاروکردەوەیانی پووچ و بێ ئاکام کرد.

لێرەدا ئەو هەڵگەڕاوانە هیدایەتیشیان بۆ ڕوون بۆتەوە بەڵام سزایەک نییە بێجگە لە سزای سەرە مەرگ و دواڕۆژ.

٥. (يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۚ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْۚ وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢١٧) البقرة. پرسیارت لێدەکەن دەربارەی جەنگ لە مانگی حەرامدا (کە بریتین لە ذوالعقدة، ذوالحجة، محرم، ڕجب)، بڵێ: جەنگ لەو جۆرە مانگانە دا کارەسات و هەڵەیەکی گەورەیە، بەرهەڵستی ڕێبازی خواو بێ باوەڕی پێی، جەنگ لەمزگەوتی حەرامدا و دەربەدەر کردنی خەڵکەکەی زۆر گەورەترە لای خوا (لە کوشتنی کەسێک یان چەند کەسێک لە مانگی حەرامدا) هەروەها ئازاردانی ئیماندار تا هاوەڵگەر بێت پاشگەز بێتەوە تاوانێکە لە کوشتن گەورەترە، (بێگومان بێ باوەڕان) بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێبکەن لە دین و ئاینتان پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێت، جا هەر کەس لە ئێوە پاشگەز بێتەوە لە ئاینەکەی و بە کافریش بمرێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان پووچەڵ دەبێت لە دنیاو قیامەتدا و ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنە سەر.

**لەم ئایەتە پیرۆزە کۆمەڵێک تاوانکاری بێباوەڕان باس کراوە لەوانە:**

- ڕێگری بەردەوام لە دینی خودا.
- کافر بوون بە خوا.
- ڕێگری لە ماڵی خوا، کە کەعبەی پیرۆزە.
- دەرکردنی مسوڵمانان لە شاری مەککە.
- جەنگی بەردەوام تا برواداران هەڵگێرنەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: هەر کەس یاخی بێ لە بڕواداران ئەگەر مرد بە کافری دەمرێت و کردارە باشەکانی هەڵدەوەشێنەوە و دەبێتە هاوەڵی ئاگر و تێیدا دەمێنێتەوە بەیەکجاری.

لەگەڵ ئەم هەڵگەرانەوەیە سزایەک باس نەکراوە بێجگە لە سزای هەڵوەشانەوەی چاکەکان و ئاگری دۆزەخ، هەندێک لە ڕاڤەکارانی قورئان هەوڵیان داوە لەم ئایەتە لەسەر وشەی (فیمت) ئەوە هەڵبێنجن کە یەکسەر دەمرێت، واتە دەبێ یەکسەر بکوژرێ، بەڵام ئەمە دوورە لە ڕاستی، چونکە خوێنی مرۆڤ لەوە گەورەترە تەنیا بە ئاماژە بڕژێنرێت، ئایا بێ ئیشکال تر نەبوو بفەرموێت: (فیقتل)؟! دواتر پێچەوانەی ئایەتەکانی ترە کە بە چڕی لە قورئاندا باس کراوە. ئەم پیتی ( فا) کە لەسەر (یمت) هاتووە بۆ عەتفە، بۆ سەر (یرتدد)، نەوەک بۆ (جزا) بێ، بەڵکو (فا)ی سەر (فَأُوْلَٰٓئِكَ) بۆ (جزا) یە، خوای گەورە زۆر شتی لە کوشتنی مرۆڤ بچوکتر باس کردووە و سزاکەشی بەڕوونی باسکردووە، بۆیە ئەم تەفسیرە دوورە لە ڕووحی قورئان.

**٦.** (كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓاْ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ) ﴿٨٦﴾ آل عمران. چۆن خوا

گەلێک هیدایەت دەدات کە دوای ئەوەی باوەڕیان هێنا، هەڵگەڕانەوە و کافر بوون؟ لە حاڵێکدا شایەتییان دابوو کەئەم پێغەمبەرە حەقەو چەندەها بەڵگەو نیشانەشیان بۆ هاتبوو (لەسەر ڕاستی محمد (صلی الله علیه وسلم)، خوای گەورەش هیدایەت و ڕێنموویی ئەو دەستەو تاقمە ستەمکارە نادات.

ئەوانە حاڵیان ڕوونە کە لە دوای ئیمان هێنان هەڵگەڕاونەوە، گەواهیشییان لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام داوە (علیه الصلاة والسلام)، بەڵگەی ڕوون و ئاشکراشیان بۆ هاتووە، خوای گەورە باسی سزا ناکا، بەڵکوو بە ستەمکار ناوزەندیان دەکات و دەیان خاتە بەر نەفرینی خۆی: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ ﴿٨٧﴾ آل عمران. ئا ئەو ستەمکارانە پاداشت و تۆڵەیان ئەوەیە: نەفرینی خواو فریشتە و هەموو خەڵکییان لەسەرە بەگشتی. ئەوە سزایایانە نەوەک کوشتن و ئیعدام کردن. ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ ﴿٨٨﴾ آل عمران. لەناو ئەو خەشم و نەفرینەدا دەمێننەوە و سزا لەسەریان سووک ناکرێت و موڵەتیش نادرێن.﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ﴿٨٩﴾ آل عمران. مەگەر کەسانێک کە فریای خۆیان کەوتبن و تەوبەیان کردبێت لهدوای ئەو لادان و یاخی بوونەیان و چاکسازیشیان کردبێت، ئەوە بەڕاستی خوا بۆ ئەوانە لێخۆشبوو و میهرەبانە، خوای گەورە دەرگای تەوبەشی بۆ کردوونەوە.

٧. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ﴾ ﴿٩٠﴾ آل عمران. بەڕاستی ئەوانەی دوای باوەڕ هێنانیان کافر بوون و لەوەودووا زیاتر ڕۆچوون لە کوفرو بێ دینیدا،

ئەوانە پەشیمانی و تەوبەیان هەرگیز لێ وەرناگیرێت، ئا ئەوانە دەستەی گومڕاو سەر لێشێواوەکانن.

لێرە باسی کافر بوون و هەڵگەڕانەوە دەکات، کە ئەمە کوفری (مغلظ) خوای گەورە خەشمی لێگرتوون و دەرگای تەوبەی لێداخستوون، دیارە لەگەڵ ئەو جۆرە کافر و هەڵگەڕاوانەیەتی کە تەوفیق نادرێن بۆ تەوبە، دەنا بە چەندین ئایەت ڕوون دەبێتەوە کە دەرگای تەوبە داناخرێت. ئەمە وەک ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: (إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ) ﴿٦﴾ البقرة. بەڕاستی ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون ئاگاداریان بکەیت یان ئاگاداریان نەکەیت یەکسانە بۆیان، باوەڕ و ئیمان ناهێنن... دیارە ئەوانە کەسانێکن کە خوای گەورە دەزانێت لەسەر کوفر دەمرن، یان وەک سورەتی (الکافرون) گومان لەوەدا نییە کە زۆر لە کافرەکان بڕوایان هێنا، ئەی بۆ دەفەرموێت: (وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ) ﴿٣﴾ الکافرون. ئێوەش دیارە ئەوەی من دەیپەرستم نای پەرستن (چونکە بت پەرستن).

کەواتە ئەوانە کەسانێکن کە بە کافری دەمرن دەنا دەرگای تەوبە تا گیانەڵا داناخرێت، ئەوکاتەش ڕۆژ لە ڕۆژئاوا هەڵدێت، وە ئەوکاتەش حەیوانەکە (دابة) کە نیشانەی دوواڕۆژە دەردەکەوێت.

٨. (إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٌ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ) ﴿٩١﴾ آل عمران. بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون و بەبێ باوەڕیی مردوون، (ئەگەر) هەریەکەیان بتوانێت پڕ بەپڕی زەوی ئاڵتون بهێنێت و بیکات بەفیدیەی خۆی هەرگیز لێی وەرناگیرێت، ئەوانە سزای بە ئێش و ئازار بۆیان ئامادەیە و کەسیش نی یە پشتیوانییان لێ بکات و فریایان بکەوێت.

ئەم ئایەتەش لەگەڵ ئایەتەکانی تری سورەتی (آل عمران) هاتووە باسی ئەوانەیە بە کافری مردوون.

**٩.** (إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا) ﴿١٣٧﴾ النساء.

بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دوایی پاشگەز بوونەتەوە، دووبارە ئیمانیان هێنایەوە و دوایی پاشگەز بوونەوە، لەوەودوا زیاتر لە بێ دینی و کافریدا ڕۆچوون، هیچ کات خوا لەوانە خۆشنابێت و ڕێنموویيان ناکات بۆ ڕێبازێکی سوود بەخش.

ئەمانە دووجار هەڵگەڕاونەوە و سورتر و خراپتر بوون لە سەر تاوان و پلانگێڕی، بەڵام سزاکەیان تەنیا ئەوەیە کە خوای گەورە لێیان خۆش نابێت و هیدایەتیان نادات.

**١٠.** (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُواْ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا) ﴿١٤٠﴾ النساء.
بەڕاستی (خوای گەورە) لە قورئاندا ئەم بڕیارەی ناردووە بۆ سەرتان کە: هەر کاتێک لە جێیەکدا گوێتان لێ بوو کوفرو گاڵتە بەئایەتەکانی خوا دەکرا، ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانەدا هەتا قسەو باسەکەیان بەگۆڕن (ئەگەر دابنیشن و گوێ نەدەنێ) ئەوە بەڕاستی ئێوەش لەو کاتەدا وەک ئەوانن و (حسابی ئەوانتان بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا دووڕووەکان و بێ باوەڕەکان هەموویان لە دۆزەخدا کۆدەکاتەوە.

ئەوانە کە بە ئایەتەکانی خوا کافرن و گاڵتەیان دێ بە ئایەتەکان دەبێ لەگەڵیان دادەنیشین بە بێ ئینکاری کردن دەنا نیشانەی ڕازیبوونە

بە کوفر و گاڵتە کردن بە دین، گومان لەوەدا نییە کە ئەوە نەوەک هەر هەڵگەڕانەوەیە بەڵکو خراپتریشە بەڵام سزای ئیعدام و کوشتنمان نییە. بۆ؟!

**١١.** (إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ) ١ المنافقون. ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێک ناپاک و دووڕووەکان دێن بۆ لات و دەڵێن: ئێمە شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت!! لەحاڵێکدا کە خوا خۆی چاک دەزانێت کە تۆ پێغەمبەر و فرستادەی ئەویت، لە هەمان کاتدا، خوا شایەتی دەدا کە ئەو ناپاک و دووڕووانە درۆزنن.

(ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ) ٢ المنافقون. ئەوانە سوێندی درۆیان کردووە بە قەڵغانی خۆیان و بەو هۆیەوە بەربەستی خەڵکیان کردووە لە ڕێبازی خوا، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد، کارێکی زۆر ناپەسەندو نابەجێ بوو.

(ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ) ٣ المنافقون. ئەو حاڵەتەشیان بۆیە تیدا دروست بووە چونکە سەرەتا باوەڕیان هێنا؛ لەوەودووا حەقیان پۆشی و کافر بوونەوە، بەهۆی ئەوەوە مۆر نرا بەسەر دڵیاندا (بۆیە تێگەیشتن و بیروبۆچوونیان شێواوە و) لە ڕاستیەکان تێ ناگەن.

(وَإِذَا رَأَيۡتَهُمۡ تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡۖ كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ) ٤ المنافقون. کاتێک دەیانبینیت سیما و لەش و لاریان سەرسامت دەکات، کاتێکیش دێنە قسە (ئەوەندە دەم بازو

قسەزانن) ئەوە گوێ دەگرێت بۆ قسەیان، دەڵێی داری وشکی بەدیواردا هەڵپەسێردراون، ئەوەندە لە ترس و بیمدا دەژین، هەر هاوارو و بانگێک بکرێت، هەر باسێک بێتە پێشەوە، وە دەزانن دژی ئەوانە، ئا ئەوانە هەر دوژمنن، کەوابوو خۆتیان لێ بپارێزە، وریایان بە، خوا بیانکوژێت و لەناویان بەرێت، ئاخر بۆچی وادەکەن، بەرەو کوێ لادران (بۆچی باوەڕی دامەزراو ناهێنن و لە ڕێبازی ڕاست لادەدەن).

ئەو ئایەتانە بەڕوونی و ئاشکرایی باسی پلان و فێڵ دەکەن، بەڵام سزاش نییە، بۆ؟!

**١٢.** (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ) ﴿٧٣﴾ التوبة. ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دژی کافرو دووڕووەکان بجەنگە و تێ بکۆشە و توند و تیژبە لەسەریان، ئەوانە سەرئەنجام و مەنزڵگەیان دۆزەخە، ئای کە سەرئەنجامێکی خراپ و ناشرینە.

(يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرًا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ) ﴿٧٤﴾ التوبة. (دووڕووەکان) سوێند بەخوا دەخۆن کە قسەیەکی نابەجێیان نەکردووە، کەچی سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە درۆ دەکەن، بەڵکو گوفتاری کوفرو بێ باوەڕی هات بەدەمیاندا، ئەوانە دوای موسڵمانبوونیان بێ باوەڕ بوونەوە، خەریکی (پیلان)و نەخشەیەک بوون بەڵام بۆیان نەلواو پێی نەگەیشتن (کە شەهید کردنی پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم)، هیچ شتێک ئەوانی تووڕە نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت: خواو پێغەمبەرەکەی (صلی

الله علیه وسلم) ئیماندارانیان دەوڵەمەند و بەهرەوەر کرد لە فەزڵ و زیادە ڕێزی خۆی، جا ئەو دووڕووانە ئەگەر تەوبە بکەن و لە ڕەفتاری نادروستیان پاشگەز ببنەوە ئەوە چاکترە بۆیان، خۆ ئەگەر پشت هەڵکەن و (هەر خەریکی نەخشەو پیلان بن) ئەوە بێگومان خوا سزای بە ئازاریان دەدات لە دنیاو قیامەتدا، کەسیش یاروو یاوەرو پشتیوانیان نابێت لە زەویدا.

ئەمەش هەڵگەڕانەوەیەکی بە ئاشکرایە، بەڵام سزای دیایکراو نییە پێی بڵێین سزای دونیایی.

بۆیە زۆرم پێ سەیرە خەڵکێکی زۆر و بەرچاو هێندە جەخت لە کوشتن و سزادانی هەڵگەڕاوە دەکەن!

کەواتە دەرکەوت قورئان نەک لەگەڵ کوشتنی هەڵگەڕاوەی ئاشتیخواز نییە، بەڵکو دژیشیەتی.

ماوەتەوە بەڵگەی فەرموودە، ئەگەر سەیری فەرموودەکانی پێشوو بکەین زۆر بەڕوونی پێغەمبەر (ﷺ) کوشتنی هەڵگەڕاوەی بەستۆتەوە بە کوشتن و ئاژاوەگێڕی و کودەتا و چەتەگەری و خراپەکاری و ....

ئەگەر سەیری سیرەی جوانی سەروەریشمان بکەین زۆر بە ڕوونی دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) بەهیچ شێوەیەک هەڵگەڕاوەی ئاشتیخوازی نەکوشتووە.

هەروەک لە فەرموودەی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کابرای دەشتەکی سێ جار داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد بۆ ئەوەی پەیمانەکەی هەڵوەشێنێتەوە چونکە دەیەوێت دەرچێت لە ئیسلام لە پاشاندا ڕۆیشت و مەدینەی بەجێهێشت بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) نەیکوشت:

أنَّ أعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ علَى الإسْلَامِ، فأصَابَ الأعْرَابِيَّ وعْكٌ بالمَدِينَةِ، فأتَى الأعْرَابِيُّ إلى رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فَقَالَ: يا رَسولَ اللَّهِ، أقِلْنِي بَيْعَتِي، فأبَى رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أقِلْنِي بَيْعَتِي، فأبَى، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أقِلْنِي بَيْعَتِي، فأبَى، فَخَرَجَ الأعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: إنَّما المَدِينَةُ كَالكِيرِ، تَنْفِي خَبَثَهَا، ويَنْصَعُ طِيبُهَا. البخاري: ٦٨٩١ _ مسلم ٣٤٢١.

وە هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دووڕووەكانی نەكوشت لەكاتێكدا دووڕوو بە دەقی قورئان هەڵگەڕاونەوە و پێغەمبەریش(ﷺ) زۆرباش دەیناسین، وە لە جەنگی تەبووكدا كۆمەڵێك لە دووڕووەكان نەچوون بۆ جیهاد و دەیان وت: بەم گەرمایە مەچن، بۆ ماڵ و حاڵی خۆتان جێدێڵن؟! بەڵام خودای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) حوكمی كوشتنی بۆ نەدان، ئەگەر (حەدد) بایە دەبوا جێبەجێكرابا.

وە هەروەها لە سوڵحی حودیبەدا پێغەمبەر(ﷺ) دوور و نزیك باسی كوشتنی هەڵگەڕاوە ناكات و تەنها فەرمووی: ڕەبی خوای گەورە دووری خاتەوە لێمان:

فَاشْتَرَطُوا علَى النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ أَنْ مَن جَاءَ مِنكُم لَمْ نَرُدَّهُ علَيْكُم، وَمَن جَاءَكُمْ مِنَّا رَدَدْتُمُوهُ عَلَيْنَا، فَقالوا: يا رَسولَ الله، أَنَكْتُبُ هذا؟ قالَ: نَعَمْ، إنَّه مَن ذَهَبَ مِنَّا إليهِم فأبْعَدَهُ اللَّهُ، وَمَن جَاءَنَا منهمْ سَيَجْعَلُ اللَّهُ له فَرَجًا وَمَخْرَجًا. مسلم: ١٧٨٤.

ئەوەی هاتووشە دەربارەی كوشتنی هەڵگەڕاوە لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) بۆ هەڵگەڕاوەی شەڕكەر و خیانەتكار بووە، نەك لەبەر خودی هەڵگەڕاوەنەوەكە.

بۆنموونە میقیەسی کوڕی سوبابە، برایەکی هەبوو بەناوی هاشم، هاشم بەهەڵە کوژرا، میقیەسیش هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای خوێنی براکەی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) خوێنەکەی دا، پاشان ئەویش موسڵمان، بەڵام ڕۆژێک چوو بکوژەکەی کوشت و خوێنباییەکەشی برد و هەڵهات بۆلای بێباوەڕەکان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکرد، بەڵام فەرمانەکە لەبەر خودی هەڵگەڕانەوە و بیروباوەڕەکەی نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی خیانەتی کرد و خوێنباییەکەشی برد و پیاوەکەشی کوشت و پەیوەندیشی کرد بە بێباوەڕەکان. کەواتە ناکرێ ئەمە بەبەڵگە بهێنرێتەوە، چونکە کوشتنەکەی لەبەر هەڵگەڕانەوە نەبووە.

وە چیرۆکی عبد الله کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرحیش لەبەر هەڵگەڕانەوە نەبووە، چونکە ئەم لە نوسەرانی وەحی بوو و پاشان هەڵگەڕایەوە و چووەوە پاڵ موشریکەکان، وەک زانایان باسییان کردووە، ئەم پیاوە لە نوسینی قورئاندا خیانەتی کردووە و چەندان شتی گۆڕیوە، ئەم پیاوە برای شیری ئیمامی عوسمان بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکرد لەبەر خیانەت کردنی، پاشان ئیمامی عوسمان داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد نەیکوژێت، پێغەمبەر(ﷺ) نەیکوشت، لێرەدا ئەوانەی بڕوایان بە کوشتنی هەڵگەڕاوە هەیە، دەڵێن ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کوشتنی هەڵگەڕاوەی دەرکردووە، ئێمەش دەڵێین: فەرمانی کوشتنەکەی لەبەر خیانەتکردن و چوونە پاڵ موشریکان بوو نەک خودی هەڵگەڕانەوە، دیارە چوونە بەرەی دوژمنیش حوکمەکەی لە هەموو یاساکاندا کوشتنە. ئینجا باشە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ نەیکوشت، خۆ ئەگەر (حەد) بێت دەبوایە بیکوژێت و کەس ناتوانێت حوکمی (حەد) جێبەجێ نەکات، ئەوەتا لە دەستبڕینەکەدا تکاشیان بۆ کابرا، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: فاتیمەی کچیشم بێت دەبێ دەستی

هەر ببڕێت، چونکە حەددە و ناکرێ جێبەجێنەکرێت، کەواتە ئەمە بەڵگەیە بۆ نەکوشتن نەک بۆ کوشتن.

چیرۆکی عبد الله کوڕی خەتەلیش بەهەمان شێوە، ئەم پیاوە دوای ئەوەی موسڵمان بوو کۆچی کرد بۆ مەدینە و پێغەمبەریش (ﷺ) کردی بە زەکات وەرگر، ئەم پیاوە لەگەڵ پیاوێکی تر دەچوون بۆ زەکات وەرگرتن، ئەم پیاوەی تر کە لەگەڵی دەچوو، خواردنی بۆ دروستدەکرد، ڕۆژێکیان کە بینی کابرا خواردنی بۆ دروست نەکردووە هەستا و کوشتی و هەموو ماڵ و زەکاتەکەشی کە کۆی کردبۆوە لەگەڵ خۆیدا بردی و هەڵهات بۆلای موشریکەکان، دوایی هەڵیشگەڕایەوە، ئێ باشە ئەمە ئەگەر حەقی کوشتن نەبێت نادادی نییە؟! کەواتە ئەمەش بەهۆی هەڵگەڕانەوە نەکوژراوە، بەڵکو بەهۆی کوشتن و خیانەت و ...

## ئازادی لە ئامانجە سەرەکییەکانی شەریعەتی ئیسلامییە
## الحرية من المقاصد الاساسية في الشريعة الاسلامية

مرۆڤەکان بە ئازادی لە دایک بوون، بەکۆیلە کردنی مرۆڤ پێچەوانەی یاسای لە دایک بوونە بە ئازاد.

**١.** ئیبن عاشور دەڵێت: ئازدی هەستێکی بەهێزە لە مرۆڤدا، بەهۆی ئازادی تواناکانی مرۆڤ بەهێز دەبن و زیاد دەکەن، وە داهێنان لە بیرکردنەوە و گوفتار و ڕەفتاری مرۆڤ وەدی دێت.

**٢.** موحەمەد غەزالی دەڵێت: ئازادی دەنگدانەوەی ناخی مرۆڤە و واتای ژیانە.

**٣.** ئیبن بادیس دەڵێ: ئازادی هەر مرۆڤێک لە ژیان وەک مافییەتی لە ژیان، بە ئەندازەی ئەوەی لە ئازادی کەم بێتەوە لە ژیانی ڕاستەقینەی کەم دەبێتەوە.

**٤.** ئەحمەد ڕاشید دەڵێت: ئازادی بە بەهاترین شتێکە کە مرۆڤ هەیبێت، مسوڵمان دەبێ شەیدای ئازادی بێت،... لە ژینگەی ئازاد دا ڕەوشتی ئەرێنی لە دایک دەبێت و توانای بەرهەمهێنان وەدی دێت.

**٥.** محمد حوسێن خزر دەڵێت: ئازادی ئەو بازنە زێڕینەیە کە مرۆڤ تێیدا دەردەکەوێت، مرۆڤ لە ئاسۆی مرۆڤ بوونی خۆی بە ئازادی لە شەقەی باڵدەدات، وە بەو ئازادییە لە هەموو دروستکراوەکان جیابۆتەوە، وە هەموو دروست کراوەکان سەریان بۆ مرۆڤ داهێناوەتەوە لەبەر ئەوەی بە ئازدی بەندایەتی و ژیان دەکات.

**٦.** ئەحمەد بەهت دەڵێت: ئازادی شتێکە بە ڕووح و ژیری مرۆڤەوە بەندە، نەمانی ئەو دووانە لە مرۆڤدا دوو واتا هەڵدەگرێت:

**یەک:** دەستدرێژی بۆ سەر ئەو بەخششە گەورەیە کە خوای گەورە بە مرۆڤی داوە.

**دوو:** مردنی مرۆڤە لەڕووی مەعنەوییەوە، وە دابەزینی پلەی مرۆڤایەتی بۆ پلەی ئاژەڵێکی ڕامکراو.

گومان لەوەدا نییە لەوەتی مرۆڤایەتی هەیە تێدەکۆشێ لەپێناو ئازادی، ئیسلام وەک بەرنامەیەکی خوایی گەورەترین پانتایی ئازادی بە مرۆڤ داوە، خوای گەورە لەسەر گرنگترین شت مرۆڤی ناچار نەکردووە کە بیروباوەڕە: (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ...) ﴿٢٥٦﴾ البقرة. وە دەفەرموێت: (وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ...) ﴿٢٩﴾ الكهف.

## جـــۆرەکانی ئـــازادی:

١- ئازادی بیروباوەڕ (حرية العقيدة)

٢- ئازادی بیروڕا (حرية الرأي)

٣- ئازادی سیاسی (الحرية السياسية)

٤- ئازادی ئابووری (الحرية الاقتصادية)

٥- ئازادی کۆمەڵایەتی (الحرية الاجتماعية)

٦- ئازادی گواستنەوە (حرية التنقل)

٧- ئازادی مەدەنی (الحرية المدنية)

٨- ئازادی دادوەری (حرية التقاضي)

٩- ئازادی لە بەرزکردنەوەی سکاڵا (حرية الترافع)

١٠- ئازادی ئاسایش و هەست کردن بە ئارامی (حرية الامن والشعور بالامان)

١١- ئازادی لە ناردن و وەرگرتنی نامە و زانیاری کەسی (حرية المراسلة)

١٢- ئازادی ڕۆشنبیری (الحرية الثقافية)

١٣- ئازادی میدیایی (الحرية الاعلامية)

١٤- ئازادی کۆبوونەوە (حرية التجمع)

١٥- ئازادی فێربوون (حرية التعلم)

١٦- ئازادی دروست کردنی سەندیکا و ڕێکخراو و ئەحزاب (حرية تشكيل النقابات والمنظمات والاحزاب)

١٧- ئازادی کار (حرية العمل)

١٨- ئازدی نیشتەجێبوون (حرية المسكن)

١٩- ئازادی خاوەنداری (حرية التملك)

٢٠- ئازادی بیمەی کۆمەڵایەتی و تەندروستی (حرية الضمان الاجتماعی والرعاية الصحية)

٢١- ئازادی خۆکاندیدکردن (حرية الترشح)

٢٢- ئازادی تاکەکەسی (الحرية الشخصية)

٢٣- ئازادی گشتی (الحرية العامة)

دیارە جۆری ئازادی تریش هەیە، وە دەشکرێ ئەوانە بخرێنە پاڵ یەک وەک بڵێین:

- ئازدی تاک و ئازادی گشتی.
- یان ئازادی سیاسی و غەیرە سیاسی .... .

ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئازادی بیرووباوەڕە.

## بنچینەکانی ئازادی لە ئیسلامدا

**١.** بنچینە لە هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ دروستییە، ئەمە دەچێتە ژێر ئەم یاسا (قاعیدە) گشتییەی کە دەڵێت: (الاصل فی الاشیاء الاباحة) واتە: بنچینە لە شتەکاندا درووستی و ڕەوایەتییە.

**٢.** بوونەوەر بۆ مرۆڤ دروست بووە و بۆی ڕامکراوە. (هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ) ﴿٢٩﴾ البقرة. هەر خۆیەتی هەرچی لە زەمیندا هەیە، بۆ ئێوەی بەرهەم هێناوە و ئەوسا پەڕژایە بەرزایی و حەوت نهوومی لێ دروست کرد. هەر ئەویشە ئاگای لە هەموو شت هەیە. [پەڕژان: خەریک بوون]

**٣.** هەرشتێک زیانی بۆ خۆت و غەیری خۆت هەبێ ئەسڵ ئەوەیە کە ڕێ پێ نەدراوە. (لا ضرر ولا ضرار)، واتە دروست نییە زیان بە خۆت و بە خەڵک بگەیەنی، وە زیان بە زیان وەڵام نادرێتەوە.

**٤.** هەر شتێک ئازادی مرۆڤ لە ناو بەرێت یان بەرتەسکی کاتەوە دەبێ لاببرێ و ڕێگری لێ بکرێ.

**٥.** سنووری ئازادی مرۆڤ ئازادی ئەوانی ترە.

**٦.** لە هیچ شوێنێکی دونیا ئازادی ڕەها نییە.

**٧.** بیرووباوەڕی دین دامەزراوە لەسەر خۆشەویستی و ترس و ڕێز گرتن و ملکەچی بۆ خوا، بۆیە تۆبزی تێدا ناکرێ بە هیچ شێوەیەک.

**٨.** کەسێک بە دین ڕازی بێ، بەدینەوە پابەند دەکرێ.

**٩.** ئازادی بیروباوەڕ مانای ئەوە نییە سوکایەتی بە پیرۆزییەکانی خەڵک بکەی، کەسێک وا بکا سزا دەدرێ مسوڵمان بێ یان ناموسڵمان.

**١٠.** بیروباوەڕی ئاییني ئیسلام لەسەر ئەوپەری بەڵگەی بەهێز دامەزراوە لە هەموو ڕوویەکەوە، بۆیە پێویستی بە زۆر لێکردن نییە.

**١١.** بیروباوەڕی ئیسلامی لە بنچینەدا عەقد و پەیمان و مامەڵەیە لەنێوان بەندە و خوای خۆی، بۆیە دەبێ ئازاد بێ لەو عەقد و پەیمانە.

**١٢.** بە دوو ڕێگا ئازادی بیروباوڕ سەلمێنراوە:

**یەک:** بەگشتی تۆبزی کردن لەوەرگرتنی دیندا نەفی کراوە: (لاإكراه في الدين) البقرة ٢٥٦.

**دوو:** خوای گەورە دەفەرموێت: ئەگەر بەزۆر ملکەچیان بکەم دەتوانم بەڵام نایکەم: (إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ) ﴿٤﴾ الشعراء. ئەگەر بمانەوێت دێینە خوارەوە بۆیان نیشانە و بەڵگەیەک لە ئاسمانەوە کە بەردەوام گەردنیانی بۆ دانەوێنن (ناچاریان بکات باوەڕبێنن).

## مێژوو ئەوە ڕەتدەكاتەوە كە ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاو بوبێتەوە

زۆر لەمێژە ئەم ناهەقی و ناڕاستییە دەبیستین كە گوایە ئیسلام بە زۆرە ملێ و بەزەبری شمشێر بڵا بۆتەوە، وە مولحیدی كوردیش ئەوە دووبارە دەكاتەوە و نووسینی لەسەر دەنووسێت و زۆرجار بڕوانامەشی لەسەر وەردەگرن! بەڵام بۆخۆشیان دەزانن كە مێژوو دووروو نزیك ئەو شایەتیەیان بۆ نادات، بۆ ڕاستی ئەم قسەیەمان چەندین بەڵگە دەخەینە ڕوو:

١. هەر بیروباوەڕێك بەزۆر و زۆرەملێ بڵاوبێتەوە هەر لەگەڵ نەمانی دەسەڵات و هێزەكە دادەڕمێ و بەس لە مێژوودا دەمێنێ، بۆنموونە وەك داگیركاری ئەورووپا بۆ جیهانی ئیسلامی كە هەموو جیهانی ئیسلامییان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەڵام بەچەند دەیەیەك ناچار بەجێیانهێشت، چونكە داگیركار بوون، هەروەك شیوعییەكان كردیان لەگەڵ ویلایەتەكانی خۆیان، هەروەك سڕبییەكان كردیان لە گەڵ بۆسنە و هەرسك و شوێنەكانی تر، نموونە ئەوەندە زۆرە لە ژمارە نایەت، ئەمریكا دیارترینی ئەو نموونانەیە لە كوبا و ڤێتنام... .

٢. هەر بیروباوەڕێك تەنیا زەویەكان بكاتەوە و دڵەكان نەكاتەوە، ئەوە ئەو بیروباوەڕە لەو زەویەدا نامێنێتەوە، وەك داگیركارە ڕۆژئاواییەكان ، یان وەك حكومەتی بەعسی ئیشتیراكی.

٣. ئیسلام هات بۆ ئازادكردنی وڵاتان نەوەك داگیركردنیان، بە بەڵگەی ئەوەی سوپای مسوڵمانان چووبنە هەر وڵاتێك لەدوای نەمانیشیان لەوێ خەڵك دەستبەرداری ئیسلامەتی نەبووە.

٤. زۆرجار مولحیدی کورد دەیەوێت بڵێ کورد بە زۆر مسوڵمانبووە، وەک ئەوەی بڵێی کورد دەوڵەتی هەبووە و ئیمپراتۆریەتی هەبووە و ئیسلام ڕوخاندویەتی! کورد بەشێکی حساب بۆنەکراو و فەرامۆش کراو بووە لە ناو دەوڵەتی ساسانی گەورەدا، وە خاوەنی هیچ سەربەخۆیی و دەسەڵاتێک نەبووە، وە لەشەڕە گەورەکانی قادسیە و جەلەولا قائیدەکانی فارس ئامادەی شەڕ بوون و تێیدا کوژراون، بەڵام بەپێچەوانەوە دەسەڵات و دەوڵەتداری کورد دوای ڕوخانی ئەو ئیمپراتۆریەتە دەستی پێکرد، کورد دوای ئەوە زیاتر لە ٦٠ ئەمارە و دەوڵەت و نیمچە دەوڵەت و هەتا نیمچە ئیمپراتۆریەتی دامەزراندووە، وە کورد لە دەوڵەتی عەباسی و عوسمانی دانی پێدا نراوە، وە سنووری ئەوکاتی کوردستان زۆر لە کوردستانی ئێستا فراوانتر بووە، وە هەتا ئێستاش کورد لە باسی سنووری کوردستان باسی ئەو نەخشانە دە کات کە ئەو کات دانیان پێدانراوە.

٥. بەڵگەی ئەوەی کە ڕاست نییە کورد بەتۆبزی مسوڵمان بووبێت لە ڕۆژ ڕوونترە، چونکە هەتا ئێستا بەدرێژایی چواردە سەدە کورد یەک شۆرشی دژی ئیسلام نەکردووە، وە دەستبەرداری ئیسلام نەبووە، بگرە شانازی بە ئیسلامەوە کردووە، بەڵام زۆرجار بگرە زۆربەی جار کورد شەڕی خۆبەخۆی کردووە، وە ئەگەر لەگەڵ خەلیفەشدا شەڕی کردبێت ئەوە دژی زوڵم شۆرشی کردووە نەوەک دژی ئیسلام، وە یان بە هۆی دەست لە پشدانی ئەم لاو ئەولا شەڕی کردووە.

٦.گەورەترین نەهامەتی کورد لەسەر دەستی ئەوروپا بووە و کوردستانی گەورەیان وەک گۆشتی خێرێ بەشییەوە بەسەر دەورووبەردا، وە مەینەتی کورد لە هەموو ڕووەکانەوە لەسەر دەستی عەلمانیەت بووە، وە ئێستا کورد لە هەرکاتێک دوورترە لە سەربەخۆیی و بەسەربەخۆ

بوون، بەداخەوە هەتا ئێستا کورد لەسەر نەخشەی سیاسی دونیا شوێنێکی نییە، من باسی ئەو هەموو ڕۆژهەڵاتناس و مێژوونووس و سەرکردانەی کە بە ئینسافەوە باسی مێژووی ئیسلامیان کردووە ناکەم چونکە یەکجار زۆرن.

**٧.** ئێمە دەبێ ئەوە بڵێین ئەگەر لەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامی ستەم و زیادە ڕەوی کرابێت لەلایەن سەرکردەیەک، هەتا خەلیفەیەک، ئەوە مانای ئەوە نییە یەکسانە بە ئیسلام، وە لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرامبەردا لە دەوڵەتانی جەنگ لەگەڵداکراودا شتێکی جوانتر لە مسوڵمانان و دەوڵەتی مسوڵمانان نەبووە، ئەگەر هەبووە بانیشانمان بدەن.

**٨.** سرووشتی دەوڵەتداری لەسەردەمی زوودا وابووە هەرکەس دەرچوون و جوڵەی نەکردبا داگیر دەکرا، بۆیە بۆئەوەی بمێنی پێویستی بە دەرچوون و فتوحات بووە، ئەو کاتانەی دەوڵەتی ئیسلامی ڕاوەستاو بووە بەرەو دواوە گەڕاوەتەوە و پاشەکشەی خێرای کردووە، ئەمە بۆ بەرامبەرەکانیش هەر ڕاست بووە.

**٩.** ئەگەر کەسێک نایەوێت لە مێژوو تێبگات با تەماشای سیستەمی سیاسی و ئابووری و سەربازی ئێستای دونیا بکات بۆی دەردەکەوێت ئەوانەی کە خەڵک بە فریادڕەسیان دەزانێ هەر ئەوانن بە بەرچاویانەوە خەڵک و وڵاتان داگیر دەکرێن و دابەش دەکرێن و پاکتاوی ڕەگەزی دەکرێن، بەڵام ئەوان بێدەنگن، بە ئاشکرا دەڵێن: ئێمە شوێن بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری خۆمان کەوتووین.

**١٠.** لە دونیای ئێستادا زۆر کردن لە سەر دین و دینداری بە پێچەوانەوەیە و بەسەر مسوڵمانناندا جێبەجێ دەکرێت، وە دەیان نموونەی زیندوومان هەیە کە هەندێکیان بە نموونە باس دەکەین:

**١.** تاجیکستان: کە لە سەدا نەوەدی مسوڵمانە، لە ساڵی ١٩٩١ سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیان، لە سەردەمی حوکمی شۆڤێنی ڕووسی یەک ملیون مسوڵمانی ئاوارە کرد، ١٠٢ هەزار کەسی کوشت، ٣٠٠ هەزار کەسی بریندار کرد، بەس لەبەر ئەوە کە مسوڵمان بوون و داوای جێبەجێ کردنی شەریعەتیان دەکرد.

**٢.** مسوڵمانانی میانمار: لەو تاوانانەی کە لەگەڵ مسوڵماناندا دەکرێت:

- ڕێگری لە زەواج
- ئاوارە کردن
- زیندانی کردنی بێ هۆ
- تاڵانکاری سەربازگەکان بۆ ماڵ و کشتوکاڵی مسوڵمانان
- ڕێگری کردن لە خوێندن
- سیاسەتی هەژار کردن
- ڕووخاندن و پیس کردنی مزگەوتەکان

**٣.** ستەمی علمانی تورکی لە مسوڵمانان لە دوای ڕووخانی خیلافەتی عوسمانی، ئەوەندە بەسە کە ٢٧ ساڵ مسوڵمانان گوێیان لە بانگ نەبوو بە عەرەبی، مسوڵمانان هەرکات دەنگی زۆرینەیان هێنابێ بە حوکمی سەربازی و بڕیاری مەحکەمەی سەربازی هەڵیانوەشاندۆتەوە و لە ناویان بردووە، مسوڵمانان بە جوهدێکی زۆر کردیان بە وڵاتی مەدەنی و ڕزگاریان کرد لە حوکمی عەسکەری و ئینقلاب لەسەر دەوڵەت بە بڕیاری عەسکەر وە هەتا ٢٠١٦ ئەو ئینقلابانە بەردەوام بوون.

**٤.** چیچان: کە لە ١٩٩١ جاڕی سەربەخۆیی دا، بەڵام ڕوسیا بە زۆری زۆرداری و حوکمی عەسکەری خستییە ژێر دەسەڵاتی خۆی، وە

ئەفغانستان و داغستان حاڵیان لەوان باشتر نەبووە، بەتایبەت ئەفغانستان زیاتر لە ملیونێک شەهیدی دا تا لە حوکمی ڕەشی ڕووسی ڕزگاری بوو.

٥. مسوڵمانان لە کشمیر.

٦. مسوڵمانان لە فەلەستین.

٧. مسوڵمانان لە بۆسنە و هەرسک لە ساڵی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو بە بەرچاوی دونیاوە لەسەر دەستی سڕبەکان چیان بەسەر نەهات لە کوشتن و داگیرکاری و دەستدرێژی سێکسی و پاکتاوی ڕەگەزی.

٨. مسوڵمانان لە تورکمانستانی ڕۆژهەڵاتی تورکی لە گەڵ کودەتای شۆڕشی شیوعی ماوتسی تۆنگ لەوکاتەوە بە چینەوە لکێندراوە و هەموو جۆرە ستەم و خراپەیەکیان لەگەڵدا ئەنجامدەدەن.

٩. مسوڵمانان لە قیرغیزیستان بەدەست حوکمی شیوعی ڕوسی توشی هەموو نەهامەتییەک هاتوون، کە لەکاتێکدا لە سەدا هەشتای مسوڵمانە، ڕوسەکان کە لە ساڵی ١٩١٦ داگیریان کرد، پازدە هەزار کەسیان کوشت و دەیان هەزار کەسیشیان ئاوارە کرد، لە ١٩٩١ سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت لەکاتی لاواز بوونی دەسەڵاتی شیوعی، لەدوای بەهێزبوونەوەی ڕووسەکان هەموو نەهامەتییەک بەسەر ئەواندا هێنرا لە:

- دابڕانیان لە جیهانی ئیسلامی.
- لابردنی زمانی عەرەبی و سەپاندنی زمانی لاتینی.
- ڕێگری کردن لە زانستی ئیسلامی و ڕۆشنبیری ئیسلامی.
- قەدەغە کردنی بانگ و ڕۆژوو گرتن.
- داخستنی زۆربەی مزگەوتەکان.

• دژایەتی کردنی سەرپۆش و حیجاب و قەدەغە کردنی لە ناو دام و دەزگا حکومییەکاندا.

**١٠.** کازاخستان: مسوڵمانان لە کازاخستان لەسەدا شێستی ئەو وڵاتە پێکدێنن، ئەویش لە ١٩٩١ سەربەخۆیی وەرگرت، دواتر بەهۆی کەمینەیەکی علمانی پاشکۆی ڕووسی و بەیارمەتی ئەوان حوکمی ئیسلامییان قەدەغە کردوو و چەند شتێکی ڕووکەشیان هێشتەوە، بە ئاشکرا قەدەغەی حیجاب و مزگەوت و چالاکی ئیسلامی و ... کرد.

**١١.** دیارە نابێ لە بیرمان بچێ مسوڵمانانی زۆر هەن کە لەبەر ئایینیان دەچەوسێنرێنەوە لە ئیستا و ڕابردوودا، ناتوانین باسی هەموویان بکەین، بەشێک لە ویلایەتەکانی هیند، بەشێک لە ویلایەتەکانی چین، مەنگۆلیا، تایلاند، فلیپین، ئۆزبەگستان، بولگاریا، تەراقیا، بەرازیل، کوبا، سۆرینام، زامبیا، زیمبابۆی ... دەیان شوێنی تر بەردەوام موسڵمانان چەوسێنراوەنەوە و دەچەوسینرێنەوە.

**١٢.** ڕاستە وڵاتانی ئیسلامی لە ئێستادا زۆرینەی مسوڵمانە، بەڵام علمانی خۆی بەسەردا سەپاندەووە و ستەمێکی زۆر لە مسوڵمانان و بانگخوازان و ڕێکخراو و حیزبە ئیسلامییەکان دەکرێت، نموونەی میسر و لیبیا و و تونس و فەلەستین و سوریا و عێراق، لە ڕابردوودا و هەتا ئێساشی لەگەڵدا بێت هەر بەردەوامە، زۆری تریش هەن بەناوی ئیسلامەوە ستەمی زۆر لە مسوڵمانان دەکەن و سزای قورسیان دەدەن لە سەر خیلافی مەزهەبی و بۆچوونی سیاسی جیاواز، وە هەیانە پەیوەندی توندوتۆڵی لە گەڵ دوژمنانی ئیسلامدا هەیە و یارمەتی سەربازی و ئەمنی و ئابووری بەکاردێنێت دژ بە مسوڵمانان.

**١٣.** لە سەدەی ڕابردوودا وڵاتانی ئیسلامی ڕووبەڕووی گەورەترین داگیرکاری و تاڵانکاری ئەوروپا بوونەتەوە و بە ماندووبوون و بە ملیونان شەهیدی خۆیان ڕزگاریان کردووە، بە تەنیا فەڕەنسا لە ڕابردوودا ٣٢ وڵاتی داگیر کردووە و ئێستاش خۆسەپاندن و دۆشینی ئابووری بەسەر ١٤ وڵاتی ئەفریقادا سەپاندووە.

هۆکاری سەرەکی ئەم تاوانکاری و داگیرکارییە ئابووری و ئایینی بووە. لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیدا زیاتر لە ٧٠ ملیۆن مرۆڤ کوژرا! بۆ؟! گیراوەکانی ئەبو غرێب و گوانتانامۆ پەڵەیەکی ڕەشە بە ڕووی ئەمریکاوە بۆ هەتا هەتایە.

## ئازادی بیروو باوەڕ لە دەستوری وەڵاتە ئیسلامییەکاندا

وڵاتە ئیسلامییەکان هەموویان جاڕنامەی مافی مرۆڤیان ئیمزا کردووە کە تێیدا بەڕوونی باسی ئەوە کراوە کە لەنێوان مرۆڤەکاندا جیاکاری نەکرێت بە هۆی دین و ڕەنگ و زمان بۆنموونە:

**المادة ١ :**

يولد جميع الناس أحرارا ومتساوين في الكرامة والحقوق. وهم قد وهبوا العقل والوجدان وعليهم أن يعاملوا بعضهم بعضا بروح الإخاء.

**المادة ٢ :**

لكل إنسان حق التمتع بجميع الحقوق والحريات المذكورة في هذا الإعلان، دونما تمييز من أي نوع، ولا سيما التمييز بسبب العنصر، أو اللون، أو الجنس، أو اللغة، أو الدين، أو الرأي سياسيا وغير سياسي، أو الأصل الوطني أو الاجتماعي، أو الثروة، أو المولد، أو أي وضع آخر.

وفضلا عن ذلك لا يجوز التمييز علي أساس الوضع السياسي أو القانوني أو الدولي للبلد أو الإقليم الذي ينتمي إليه الشخص، سواء أكان مستقلا أو موضوعا تحت الوصاية أو غير متمتع بالحكم الذاتي أم خاضعا لأي قيد آخر علي سيادته.

**المادة ٣ :**

لكل فرد حق في الحياة والحرية وفى الأمان على شخصه.

### المادة ٤ :

لا يجوز استرقاق أحد أو استعباده، ويحظر الرق والاتجار بالرقيق بجميع صورهما.

### المادة ٥ :

لا يجوز إخضاع أحد للتعذيب ولا للمعاملة أو العقوبة القاسية أو اللاإنسانية أو الحاطة بالكرامة.

هەموو وەڵاتانی ئیسلامی ئەم جاڕنامانەیان ئیمزا کردووە و لە دەستوری عێراقیشدا هاتووە.

### المادة ٢ :

**أولاً:**

الاسـلام دين الدولـة الرسمي، وهـو مصدر أسـاس للتشريع

**أ.** لا يجوز سن قانون يتعارض مع ثوابت احكام الاسلام.

**ب.** لا يجوز سن قانون يتعارض مع مبادئ الديمقراطية.

**ج.** لا يجوز سن قانون يتعارض مع الحقوق والحريات الاساسية الواردة في هذا الدستور...

**ثانياً:**

يضمن هذا الدستور الحفاظ على الهوية الاسلامية لغالبية الشعب العراقي، كما ويضمن كامل الحقوق الدينية لجميع الافراد في حرية العقيدة والممارسة الدينية كالمسيحيين والآيزديين والصابئة المندائيين.

المادة ٣ :

العراق بلد متعدد القوميات والأديان والمذاهب، وهو عضو مؤسس وفعال في جامعة الدول العربية وملتزم بميثاقها و جزء من العالم الإسلامي.

ئەگەر بێتو دەوڵەتێک سزای موورتەد وەک (حەد ) جێبەجێ بکات ئەوە پێچەوانەی ئەم بەڵێنە جوڵاوەتەوە کە ئیمزای لەسەر کردووە، وە ناکرێ ئەم یاسایەی کە دەڵێت: ((نابێ یاسایەک دەربچێ پێچەوانەی (ثوابت) نەگۆڕەکانی دین بێ))، بەسەر ئەم بابەتەدا جێبەجێ بکرێت، چونکە بەهیچ شێوەیەک کوشتنی مورتەدد لە سەوابیت و قەتعیاتی دین نییە، نەک سەوابیتی دین نییە بەڵکو پێچەوانەی قورئان و سیرە و سوننە و ڕووح و یاسا و مەبەستە گشتییەکانی ئیسلامە.

پێم سەیرە ڕۆژگارێک ئیسلام باسی ئازادی بیروباوەڕی کردووە کە دەوڵەت و ئایین و دەستوورە باوەکانی ئەوکات بڕوایان پێ نەبووە، بەڵام ئێستا وڵاتانی غەیرە مسوڵمان باسی دەکەن و بەشێک لە مسوڵمانانیش پێی تەنگە نەفەس بوون و ناچێتە عەقڵیانەوە! وەک ئەوە وایە کە ئیسلام هێندە دەسەڵاتی هەبێ هەموو شتی جێبەجێ کردبێت تەنیا یاسای هەڵگەرانەوە و کۆیلایەتی ماوە جێبەجێی بکات.

## حوكمي كوشتنى هەڵگەڕاوە وەك چەكێك بەدەستى دەستەڵاتدارانەوە بۆ لەناوبردنى نەيارانيان

یەکی لە کارەساتەکانی حوکمی کوشتنی هەڵگەڕاوە بریتییە لەوەی کە بەدرێژایی مێژوو وەک چەکێک بەکارهێنراوە لەلایەن دەستەڵادارانەوە بۆ لەناوبردن و نەهێشتنی نەیارانیان، ئینجا کێشەکە لەوەدایە کە مەفهومی ئیمان و ئیسلام و کوفر لای زانایان و قوتابخانە و ڕێبازەکان جیاوازە و هی وا هەیە پێوەری وای داناوە کە بەم پێیە دەبێ هەموو خەڵک هەڵگەڕاوە بێت و پاشانیش بکوژرێت! بۆنموونە سەددام حوسێن بەبەڵگەی هەڵگەڕانەوەی کورد دەهات ناوی سورەتێکی قورئانی وەک (ئەنفال)ی بەکاردێناو کوردی پێ دەکوشت، بەحیساب کورد لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە و هەڵگەڕاوەش لە دین دەبێ بکوژرێت!

ئینجا ئەگەر سەیری مێژووش بکەین دەیان زانا دەبینین کە تەکفیر کراون و حوکمی هەڵگەڕانەوەیان بەسەردا دراوە و بەشێکیشییان کوژراون! بۆنموونە:

أحمد بن نصر الخزاعی، أبوحیان التوحیدی، محمد عبدالکریم بن أحمد، محمد بن علی بن الحسین بن علی المیاخی، الکیاهراسی، أبو نصر منصور بن علی بن عراق الجعدی، إبراهیم بن عمر بن حسین بن رباط بن علی بن أبی بکر البقاعی، ابن الابار الاندلسی، أحمد بن إبراهیم أبو جعفر الاندلوسی، صدقة بن الحسین أبو الفرج ابن الحداد البغدادی الحنبلی، ابن زرقون شیخ المالکیة، سیف الدین علی بن أبی علی بن

محمد بن سالم التغلبی الامدی، محمد بن عبد الله بن سعید بن علی بن أحمد التلمسانی، أبو الحجاج جمال الدین الامام الكبیر الحاظ، المزي.[١]

ئینجا نەک هەر ئەوەندە بەڵکو چەندان سوفی و عاریفی وەک عبد الله کوڕی موقەففەع و شهاب الدینی سوهرەوەردی و حسێنی مەنسووری حەللاج و عەینولقوزاتی هەمەدانی و ... بە تۆمەتی هەڵگەڕانەوە لە ئایین کوژراون، لەکاتێکدا ئەوانە با هەڵشییان بووبێت بەڵام بەسەدان خراپەکار و زاڵم و ... لە کومەڵگەدا هەبوون و کەسیش هیچی لێنەکردوون، بەڵکو زۆرێک لە سەرکردەکان خۆیان سەرمەشقی خراپەکاری و ... بوون، کەوایە کوشتنی ئەمانە لەپای چی؟!

بۆیە لەکۆتاییدا ئەگەر ئەم دەرگەیە دانەخرێت مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە بە بێنووی هەڵگەڕانەوە سەدان و هەزاران کەس لەنێو دەبرێن و چەندان نەتەوە و گەلیش تووشی نەهامەتی و مەترسی دەبن بەم هۆیەوە و کۆمەڵگە دەشێوێت و شیرازەی وڵات و نیشتیمان لێک هەڵدەوەشێت، هەروەک بینیمان داعش و هاوێنەکانی بەناوی تەکفیر و ... هەزاران کەسیان کوشت!

---

(١) إشكالية الردة والمرتدين، د. طه جابر العلواني، ١٦٣.

# ئەنجام

١- سەرچاوەی سەرەکی تەشریع و ئیسلام بریتییە لە قورئان و سوننەی سەحیح.

٢- تێگەیشتنی هەر بابەتێک پێویستە یەکەمجا لەژێر ڕۆشنایی قورئاندا بێت، قورئانیش نەک بەشێکی بەڵکو هەموو قورئان و یاسا گشتییەکان و ڕووحەکەی، ئینجا دەگەڕێنەوە بۆ سوننەت و فەرموودەکانی سەروەرمان (ﷺ)، ئەمەشیان بەهەمان شێوە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ هەموو سوننە و فەرموودەکان و نەک تەنها ئەو فەرموودانەی لەگەڵ ڕای مندا دێنەوە، ئینجا سوننەتیش دەبێ لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سیرەی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) و کۆی گشتی فەرموودەکان و یاسا ئوسوڵییەکان و مەقاسیدی شەریعە و ڕووحی ئیسلام و یاسا گشتییەکانی ئیسلامدا ڕاڤە بکرێت، نەوەک لەژێر ڕۆشنایی سەردەمی ڕابردوو و باردۆخی تایبەتی ئەوکات و کاریگەری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەوکات یان تێگەیشنی چەند زانایەک.

٣- یەکەم هەڵگەڕاوە لە دین لە مێژوودا شەیتان بوو، بەڵام خوای گەورە زۆرترین تەمەن و هێزی پێدا.

٤- خوای گەورە مرۆڤایەتی بۆ تاقیکردنەوە درووست کردووە، ئەگەر مرۆڤ ئازاد نەبێت چۆن تاقیدەکرێتەوە؟!

٥- مرۆڤ چۆن دەتوانێت چاک و خراپ هەڵبژرێت ئەگەر توانای نەبێ و دەستبەسەر بێت.

٦- چۆن دەکرێ بابەتێکی ئاوا گرنگ قورئان باسی نەکات، لەکاتێکدا چەندین شتی زۆر لەوە ئەهوەنتر باس کراوە، باسی چوونە ماڵان کراوە، باسی لەچک و سەرپۆش کراوە، باسی درۆ و بوهتان و دزی و... کراوە، لەکاتێکدا کوشتنی هەڵگەڕاوە لە هەموو ئەم بابەتانە گەورەترە؟!.

٧- بیروباوەڕ بە دڵ قبوڵ دەکرێ، چۆن دەکرێت بە تۆبزی تۆبە بە کەسێک بکەیی و بیکەیە مسوڵمان!؟.

٨- ئەگەر کەسێک بە درۆ مسوڵمان بێت دەبێتە (منافق) دووڕوو، ئایا کامەیان ئەهوەنتر و کەمزیانترە؟

٩- ئەگەر سەرنجی قورئان دەبینین جەخت لەسەر چەند خاڵیک دەکاتەوە لەم بارەیەوە: هەموو کەسێک ئازادی بیروباوەڕی هەیە. تۆبزی و زۆر لە کەس ناکرێت. هەر سزایەک هەبێت بۆ هەڵگەراوەی ئاشتی خواز یان بێباوەڕی ئەسڵی لە قیامەتدایە نەک لە دونیا، بۆیە ئەگەر لە ئایەتەکان وردبینەوە سزای دونیایی بۆ دانەناون و لە هەموویاندا دەفەرموێت: لە قیامەتدا سزا دەدرێن. ئاشتی ئەسڵە و هەتا هێرش نەکرێت هێرش نابرێت، هەتا شەڕ نەخوازرێت شەڕ ناکرێت، هەتا ئاشتی هەڵبژێرن پێکەوە ژیانیان لەگەڵدا دەکرێت.

١٠- پێویستە زۆر بە وردی جیاکاری بکەین لە نێوان ئەم دوو دەستەواژەیە: (مرتد ومتمرد) واتە: هەڵگەڕاوە و سەرکەش (یاخی)، و ( خارج عن الاسلام والخارج علی الاسلام) واتە: دەرچوون لە ئیسلام و دەرچوون لە دژی ئیسلام و موسڵمانان و جەنگان لە گەڵیاندا.

هەڵگەڕاوە بە پێی دەقەکانی ئایەت و فەرموودە کێشە دروست ناکات بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، واتە: ئەوەی پێی دەوترێت: مورتەد یان دەرچوو

لە ئیسلام، بەڵکو ئەو کەسەی یاخی دەبێت و ئاشووب و ئاژاوە دەنێتەوە و پلانگێڕی دەکات و چەتە و ڕێگری دەکات و بەناهەق کودەتا بەسەر مسوڵمانانادا دەکات، ئەو جۆرەیان بەپێی تاوانەکەی سزا دەدرێت، یان دەبەخشرێت ئەگەر بۆ ئیسلام و مسوڵمانان ئەوە باش و سوودبەخش بوو.

**جــۆری یەکــەم :** واتە: هەڵگەراوە بەبێ ئاژاوە نانەوە، قوڕئان باسی کردوە و سزاشی بۆ دانەناوە وەک ئەو ئایەتانە: (وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ) ﴿٧٢﴾ آل عمران.

دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) وتیان بەتاقمێکیان: ئێوە لە سەرەتای ڕۆژدا (بەدرۆوە) ئیمان و باوەڕ بهێنن بەو (قورئانەی) بۆ ئیمانداران ڕەوانە کراوە، بەڵام لەکۆتایی ڕۆژدا و دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە (تا دوودڵی و گومانیان تێدا دروست ببێت) بۆ ئەوەی پاشگەز ببنەوە.

(كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓاْ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ) ﴿٨٦﴾ آل عمران.

(إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ) ﴿٩٠﴾ آل عمران٤. (إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا) ﴿١٣٧﴾ النساء.

ئەوانە هەموو هەڵگەڕانەوەن بەڵام مەترسی بۆ سەر کیانی دەوڵەت و کۆمەڵگەی مسوڵمانان دروست ناکەن، زیانەکان بە پلەی یەکەم بۆ خۆیانە، وە مسوڵمانانیش دەیان ناسن بۆیە سزا نادرێن، بەڵکو وریایان دەبین و چاومان لەسەریان دەبێ و خەڵکیان لێ ئاگادار دەکەینەوە جیهادیان بە ئامۆژگاری و هەندێک جار وریایی دان و هەنێک جار بە پشت گوێ خستن لەگەڵدا دەکەین، بەڵام ئەگەر هەڵگەڕانەوەکەیان هاوکات بوو لە گەڵ ئاشوب و کوشتن و مافیابوون و کودەتای بەناهەق ئەوانە بەپێی تاوانەکەیان سزا دەدرێن بەپێی بەرژەوەندی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەگشتی و کۆمەڵگەی مسوڵمانان بەتایبەتی.

**جۆری دووەم:** هەڵگەڕانەوە هاوکات لەگەڵ ئاژاوە و چەتەگەری: خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ) ﴿٣٣﴾ المائدة. بێگومان پاداشتی ئەوانەی کە دەنجێگن و دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی فەساد و بەدڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە: (ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە) دەبێت بکوژرێن، (ئەوانەش کەخەڵکیان کوشتووە و جەردەییشیان کردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، (ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن) دەست و قاچێکیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان کە مەترسیان لێدەکرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە وڵات، ئەو سزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لە دنیادا، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆهەیە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونترین ئایەتە دەربارەی ئاژاوە و کوشتنی بە ناهەق و چەتەگەری، دژیەکی لە نێوان قورئان لەگەڵ قورئان و

سونەت لەگەڵ سونەت و قورئان لەگەڵ سونەت دا پەیدا ببێت، چونکە ئەوانە هەموو تەواوکاری یەکترن نەوەک دژیەک، چونکە ئایەتەکە زۆر ڕوونە بەتایبەت ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ هۆکاری دابەزینەکەی: حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ نَاسًا مِنْ عُرَيْنَةَ اجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ، فَرَخَّصَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْتُوا إِبِلَ الصَّدَقَةِ فَيَشْرَبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَقَتَلُوا الرَّاعِيَ وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَّعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ وَتَرَكَهُمْ بِالْحَرَّةِ يَعَضُّونَ الْحِجَارَةَ. رواه البخاری ١٥٠١

عوکل و عورەینە ئەوانە بوون هاتن بۆ مەدینە مسوڵمان بوون، لە مەدینە بەهۆی جیاوازی ژینگە و ئاو و هەواکە نەخۆش کەوتن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) روخسەتی پێدان بچن بۆلای ئەو وشترانەی زەکات، کە شوێنی تایبەتیان لە دەرەوەی شار بۆ دابین کرابوو، بۆ ئەوەی لە میز و شیری وشترەکان بخۆنەوە، ئەوانیش چوون ئەو کارەیان کرد، هەرکە چاکبوونەوە شوانەکەیان کوشت و وشرەکانیشیان بەتاڵان برد و دواییش گەڕانەوە لە ئیسلام، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانی سزادا لە هەقی ئەوەی خیانەتیان لە ئەمانەت کرد، چونکە: شوانەکەیان کوشت و وشترەکانیان بەتاڵان برد و هەڵیش گەڕانەوە.

لێرەدا ئاژاوە و هەڵگەڕانەوە بەیەکەوە لەو ڕووداوە دەبینین، بەبێ ئەوەی زانایان وەک پێویست تەرکیزی لەسەر بکەن، لەکاتێکدا فەرموودەکە لە سەرچاوە سەحیحەکاندا هەیە، زۆربەی پەرتووکەکانی هۆکارەکانی دابەزینی قورئان باسیان کردووە، بەڵام ئەوانەی لەگەڵ کوشتنی هەڵگەڕاوەن خۆیان لێ بواردووە، چونکە تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ بیروڕاکەی ئەوان.

هەڵگەڕانەوە و کودەتا، یەکێکی تر لەو بابەتە گرینگانە کە تێکەڵبوونی تێدا دروست بووە، بابەتی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام هاوکات لەگەڵ کودەتا، دەبێ ئەم دوو بابەتە لێک جیا بکرێتەوە، (مرتد) جیاییە لە (متمرد)، (خارج عن الإسلام) جیایە لە (خارج على الإسلام).

جۆری یەکەم واتە ئەوەی دەردەچێت لە ئیسلام بەبێ یاخی بوون و کودەتا، حوکمی کوشتن نییە، لەبەر ئەو هەموو بەڵگەی هێنامانەوە، بەڵام ئەگەر یاخی بوون و کودەتای تێدا بوو وەک ئەوەی لەسەردەمی ئەبوبەکر ڕوویدا (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم جۆرەیان گەورەی مسوڵمانان دەستی واڵایە بەوەی ئایا چ جۆرە سزایەکیان بەسەردا جێ بەجێ دەکا وەک لەو ئایەتەدا ڕونکراوەتەوە بە ڕاشکاوی کە دەفەموێت: (إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ .....) ﴿٣٣﴾ المائدة. هەروەک لە فەرمودەکەشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت (عليه الصلاة والسلام): قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ ؛ الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ «. رواەالبخاری ١٦٧٦، لەم فەرموودەدا دوو ڕستە هەیە کە زۆر ڕوونە کە بە چ هۆیەک خوێنی کەسەکە حەڵاڵ دەبێت: ڕستەی یەکەم: (التارک لدینه) ئەوە بەمە لە دین چۆتە دەر و کافر بوو، بەڵام ڕستەی دووەم بۆمان بەیان دەکات کە تاوانەکە بەس کافر بوون نییە، بەڵکو (المفارق للجماعة) ئایا دەرچوون لە جەماعەت ماناکەی ڕوون نییە لە وەی کە لە کۆمەڵگەی مسوڵمانان جیابۆتەوە و پەیوەندی بەکافرانەوە کردووە؟!

ماناکە زۆر ڕوونە و ناکرێ بەهەند وەرنەگیردرێت. بەتایبەت لە ڕوایەتی تردا هاتووە کە دەفەرموێت: «(الْمَارِقُ مِنَ الدِّينِ) واتە: لە دین

دەرچوو، (التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ) واتە: وازی لە جەماوەری موسڵمانان هیناوە. رواه البخار ٦٨٧٨. کەواتە ئەگەر سەرنج بدەین و لێی وردبیتەوە دەبینین دەرچوون لە دینی جیاکردۆتەوە لە دەرچوون لە کۆمەڵی موسڵمانان و پەیوەندی کردن بە دوژمن. کەواتە ئەگەر سیفەتی (التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ) واتە: (وازی لە جەماوەری موسڵمانان هیناوە) تێدا نەبوو ئەوە بەهیچ جۆرێک ئەو حوکمە نایگرێتەوە و ناکوژرێت. وە لەڕیوایەتی تردا هاتووە کە دەفەرموێت: (رَجُلٌ خَرَجَ مُحَارِبًا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ) واتە: دەرچووە و شەڕی ڕاگەیاندووە دژی خوا و پێغەمبەرەکەیی و ئیسلام و موسڵمانان. رواە ابوداود. ٤٣٥٣ .

بەکورتی بابەتەکە پەیوەدنی هەیە بە خیانەت و دەرچوون لە دەوڵەت و کۆمەڵگە و خەڵک نەوەک دەرچوون لە ئایین، چونکە بە دەرچوونی لە ئایین بەبێ خیانەت و ئاشوب و شەڕ و گێرەشێوێنی هیچ زیانێک لە کەس نادات، بەڵام بەدەرچوونی لە دەوڵەت و کۆمەڵگە و خەڵک و ئاژاوە و ئاشوب و کودەتا و گێرەشێوێنی زیان بە هەموان دەگەیەنێت، کەواتە مەبەستەکە خیانەت و زیانگەیاتدن و تێکدانی کۆمەڵگە و گێرەشێوێنی و ئاشووبە نە شتی تر.

**١١.** قاعدەیەکی (أصولي) جوانمان هەیە: ئەگەر هاتوو وشەیەک لە دوو دەقدا هاتبوو لە حوکم و سەبەبدا یەک بوون، یەکیان عام بوو و ئەوی تریان خاص، ئەوە دەبێ حەملی عام بکەین بۆ سەر خاص.

کەواتە هەموو ئەو فەرموودانەی کە بە گشتی و عام هاتوون دەبێ ڕاڤە بکرێن بە دەقەکانی تر لە قورئان و سوونەت و سیرەی سەروەرمان (ﷺ) بۆنموونە فەرموودەی: (من بدل دينه فاقتلوه) واتە: هەر کەسێک دینی گۆڕی بیکوژن، ئەم فەرموودەیە عام و گشتییە بەڵام بە پێی یاسا

ئوسوڵیەکە: (ئەگەر هاتوو وشەیەک لە دوو دەقدا هاتبوو لە حوکم و سەبەبدا یەک بوون، یەکیان عام بوو و ئەوی تریان خاص، ئەوە دەبێ حەملی عام بکەین بۆ سەر خاص.) دەبێ هەموو فەرموودە عام و گشتییەکان حەمل بکەین و بیانگێڕینەوە بۆ دەقە خاص و تایبەتکراوەکان چونکە تەبدیلی دین (عام)ە، بەڵام (المفارق للجماعة) تخصیص ی دەکا.

بۆیە ئەم فەرموودە گشتیانە تایبەت دەکرێن بە قورئان، چونکە وەک باسمانکرد دەیان ئایەت لەگەڵ ئازادیدایە و دژی کوشتن و تۆبزی لێکردنە، بۆیە تاکە ئایەتێکت دەستناکەوێت کە بفەرموێت: مورتەدد بکوژن.

فەرموودە تایبەتەکان (خاصەکان)، وەک باسمانکرد چەندان فەرموودە بە تایبەتکراوی هاتوون و بە ڕاشکاوی وتوویانە تەنیا ئەوانە دەکوژرێن کە شەڕکەر و ئاژاوەگێڕ و خیانەتکارن.

سیرەی جوانی سەروەرمان (ﷺ)، سەیری سەروەرمان دەستەڵاتی تەواوی هەبوو بەڵام هەڵگەڕاوەی ئاشیخوازی هەرگیز نەکوشتووە.

مەقاسیدی و شەریعە و یاسا گشتییەکانی ئیسلام دژی ئەوەن، چونکە کوشتنی هەڵگەراوەی ئاشیخواز هیچ سوودێکی نییە غەیری زەرەر و زیان.

بۆیە لەکۆتاییدا ئەگەر بمانەوێت سەدان ئایەت و دەیان فەرموودە و سیرەی جوانی پێغەمبەر (ﷺ) و یاسا گشتییەکانی ئیسلام و مەقاسیدی شەریعە و ڕووحی ئیسلام بپارێزین دەبێ بێێن ئەم چەند فەرموودە گشتیانە ڕاڤە بکەین لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودەکانی تر، کە ئەمەش تەواو تەواو یەکانگیرە و لەگەڵ قورئان و سوننە و سیرە و مەقاسیدی شەریعە و یاساکانی ئوسوڵی فیقە.

**١٢.**ئەوەی کە دەوترێت: کوشتنی هەڵگەراوە (مورتەدد) ئیجماعی لەسەرە، هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە بەپێی پێناسانەی زانایان بۆ ئیجماع دەبێ کۆ دەنگی هەموو زانایانی ئوممەتی ئیسلامی لەسەر بێت. ئەگەر پرسیار لە خۆمان بکەین ئایا کۆدەنگی زانایان لە هەموو ئوممەتی ئیسلامی کەیی و لە چ وەختێک هاتۆتە دی؟ من دەڵێم بەم پێناسەیە هەتا ئێستا ئیجماعێک نابینی لەسەردەمی هاوەڵانەوە هەتا ئیستا، زانایان هەموو یەک دەنگ بن لە سەری بێجگە لە بابەتە یەکلابووەکان لە قورئان سونەتدا، وەک فەرزی نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات... وە حەرامی شیرک، درۆ، زینا، کوشتنی نابەهەق... ئەوانە پێویستیان بە کۆدەنگی نییە، بۆ؟ ئەو شتانە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) یەکلا بوونەوە بە قورئان، یان بە سوننەت. لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئیجماع سوودی نییە، چونکە ئەگەر موافقی قورئان و سونەت بێت ئیعتیبار بۆ قورئان و سونەتە نەوەک بۆ ئیجماع، وە ئەگەر ئیجماع پێچەوانەی قورئان سونەت بێ حیسابی بۆ ناکرێت و کۆدەنگی درووست نابێت. لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پەرت بوون بە دونیادا، هیچ کات نەکراوە ئەوان بۆ بابەتێکی تازە کۆ ببنەوە و هەموو یەک دەنگ بن، ئەم کارە لە ئێستاشدا ناکرێ بەو هەموو تەکنەلۆجیا پێشکەوتووەی کە لەبەر دەستدایە، چ جای ئەو کات کە بەس بەینی مەککە و مەدینە ٥٠٠ کیلۆ مەترە بێجگە لە وڵاتان و شوێنە دوورە دەستەکان. ئەوەی کە پێی وتراوە ئیجماع زۆرجار ئیجماعی ئەهلی مەدینە بووە، خۆ ئەگەر ئیجماع بریتی بێت لە کۆدەنگی زانایانی مەدینە یان مەککە دەبێ پێناسەکە لە ڕیشەوە بگۆردرێت دەنا هەموو پێناسەکان هەڵە دەردەچن، هەیە لە زانایان یەک دەنگی چوار مەزهەبەکەشی بە ئیجماع زانیوە و حیسابی بۆ مەزهەبەکانی تر نەکردووە. هەندێکیان زۆر جار وتویانە: نەمان زانیوە

خیلافی ئەوە هەبێت، یان ئێمە زانیاریمان نییە کە خیلاف هەبێت، هێشتا ئەوە زۆر باشترە. یان ئیجماعەکەی ئەوان باسی دەکەن ئیجماعێکی سکوتی یە (الاجماع السکوتی) وە ئیجماعی سکوتی ئەو ئیجماعە نییە کە لە پێناسەکاندا هاتووە، چونکە ئەگەر فەتوایەک دراو و ئەوانی تر بێدەنگ بوون زۆر هۆکار هەیە بۆ بێدەنگی زانایانی تر: لەوانەیە بابەتەکەیان هەر پێ نەگەیشتبێ بۆیە قسەیان نییە لەسەری. یان هێشتا بەلای ئەوانەوە شتەکە تەواو یەکلا نەبۆتەوە و دیراسە نەکراوە. بابەتەکە زۆر درەنگ بە دەستیان گەیشتووە. یان نەوێراون لەبەر دەسەڵات و سوڵتە بۆچوونی خۆیان بڵێن. یان جاری وایە فتواکەیان بە هەڵە نەقڵ کراوە.

**١٣.** ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کێبەکانی فقە و شەرحی حەدیس، بە ڕوونی جیاوازی لە نێوان زانایاندا دەبینین لەم بابەتانە: جیاوازی هاوەڵان لەسەر کوشتنی مورتەد، لەوانە عومەر ڕەزای خوای لێ بێ، بە ئامادەبوونی هاوەڵان داوای کردووە کە دەبوو داوای تەوبەیان لێکردبا و ڕۆژانە خواردنیان پێدابا. بەشێک لە تابیعی لە گەڵ کوشتنی مورتەد نەبوون وەک ئیبراهیمی نەخەعی بەڵکو لەگەڵ تەوبە پێ کردن دابووە. لای ئەبو حەنیفە ئافرەتی مورتەد ناکوژێ. لای شافیعیەکان و حەنبەلیەکان داوای تەوبەی لێدەکرێ، لە کاتێکدا لەو فەرموودانەی کە ئەوان بەبەڵگەیان هێناونەوە باسی تەوبە نەکراوە. باسی استتابة (داوای تەوبە کردن لەکەسی هەڵگەراوە) لە فەرموودە صەحیحەکاندا نەهاتووە، زیاتر فەقیهەکان و فەرموودەناسەکان وەک ناونیشان بۆ هەندێک فەرموودەکان دایان ناوە.

**١٤.** لەکۆتاییدا پرسیارێک دێتە ئاراوە کە بۆچی زانایان ئەوا یەک دەنگ دەردەکەون لەسەر کوشتنی مورتەد؟ زانایان لەبەر ئەم هۆکارانە ئاوا دەردەکەون: لەبەر متمانە بوونی لە ڕادەبەدەر بە فەموودەی (من بدل

دینە فاقتلوە)، و نەگەڕانەوە بۆ کۆی گشتی فەرموودەکان و قورئان و سیرەی پێغەمبەر (ﷺ) و یاسا ئوسوڵییەکان.ویست و حەزی دەسەڵاتی سیاسی بۆ سەرکووت کردنی نەیارەکانیان بە بیانووی هەڵگەرانەوە لە دین یان لە دەسەڵاتی سیاسی. بۆ ڕێگری کردن لە لەبەریەکهەڵوەشانی کۆمەڵگەی موسڵمانان و دزەکردنی ناموسڵمانان بۆ ناو ئیسلام و موسڵمانان بە ناڕاستگۆیی و دوایی هەڵگەڕانەوەیان و لە دژ وەستانی موسڵمانان، چونکە موسڵمانان سەردەمانێکی زۆر لە ململانیدا بوون بەرامبەر شارستانییەکانی تردا. ڕاڤەکردنی کرداری سەحابی بە ئیجماع، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت) شتی ڕاجیاییان زۆر بووە. شلگیری (التساهل) لە بابەتی ئیجماعدا و تێنەگەیشتن و جیێبەجێنەکردنی وەک خۆی، بۆیە دەبینین زۆرجار فەتواکان ناو نراون بە ئیجماع بەبێ ئەوەی مەرج و پێناسەی ئیجماعیان بەسەردا ببڕێت.

**١٥.** زۆرێک لە زانایان و کتێبە فیقهییەکان هەڵگەڕانەوەیان لە دین بە (حد) هەژمار نەکردووە و لە باسی (حد) دا نەیانهێناوە، کەواەیە مایەوە (تعزیر) ئەوەشیان دیارە هەرگیز ناگات بە کوشتن و بەپێی بەرژەوەندی و بارودۆخ سەرۆک و ئیمام بڕیاری لەبارەوە دەدات.

**١٦.** حوکمی کوشتنی هەڵگەڕاوە بەدرێژایی مێژوو دەرگایەکی زۆر مەترسیداری بەسەر دەستەڵاتدران کردۆتەوە و بەهۆیەوە چەندان زانای گەورە و کەسایەتییان بە هەڵگەڕاوە لەقەڵەم داوە و کوشوتونیان، بۆیە ئەم بابەتە ئەگەر بەهەستیارییەوە مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێت کارەسات دەخولقێنێت وەک ببینیمان سەددام حوسێن چۆن ئەم بابەتەی بەکارهێناو کوردی بە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام لەقەڵەمدا و پاشان بە ناوی ئەنفال و کوشتنی هەڵگەراوە کوردی قڕ کردا یان داعش و هاووێنەکانی.

**١٧.** ئیمامی شافیعی دووڕای زۆر جوانی هەیە کە بۆ ئەم بابەتە و بابەتانی تریش زۆر پێویستە، دەفەرموێت: لەنێوان دوو فەرموودەی ناکۆکدا کامەیان زیاتر بە قورئان چوو و زیاتر لەگەڵی هاتەوە ئەوە هەڵدەبژێردرێت، وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی کە کردوویەتی ئەوەبووە کە لەقورئان تێگەیشتووە، کەواتە کرداری ئەو یەکسانە بە تێگەیشتنی ئەو لە قورئان، بەپێی هەردوو وتەکەش قورئان دژی کوشتنی هەڵگەڕاوەی ئاشتیخوازە.

**١٨.** لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەمە بەمانای ئەوە نییە دەرگا بخرێتە سەر پشت و خەڵک هانبدرێت و هەرکەس ڕاستبۆوە بێت سوکایەتی بە ئیسلام و موسڵمانان و پیرۆزی ئەو هەموو خەڵکە بکات، نەخێر، ئەوکات ئەگەر دەستەڵاتێکی ڕاستگۆ هەبێت هەموو ئەمانە بە یاسا ڕێکدەخرێن و ئەم کێشەیەش ڕووبەڕوومان نابێتەوە.

## مەبەست و ئامانجەکانی قورئـان[١]

مەبەست و ئامانجەکانی قورئان (مقاصد القرآن): هەموو ئەو ئامانج و مەبەست و حیکمەتانەن کە قورئان دەیەوێت بیانهێنێتەدی لە میانەی دەقەکانی و کۆی بابەتەکانی، کە ئەوەندە فراوانە کۆ ناکریتەوە و (حصر) ناکرێت.

هەندێ پێناسە بۆ مەبەست و ئامانجەکانی قورئان (مقاصد القرآن)

(الغايات اللتى أنزل القرآن لأجلها تحقيقا لمصالح العباد) .

• معظم مقاصد القرآن الامر باكتساب المصالح وأسبابها، والزجر عن اكتساب المفاسد وأسبابها.

• هى المقاصد اللتى دارت عليها سور القرآن الكريم وآياته تعريفا برسالة الاسلام، وتحقيقا لمنهجه فى هداية البشر.

لەم سێ پێناسەیەوە دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز بە سورەت و ئایەتەکانیەوە هاتووە بۆ ڕێنمایی مرۆڤ و بەختەوەر کردنی و جێبەجێ کردنی بەرژەوەندیەکانی و لێدور خستنەوەی مەفسەدە و خراپەکان لە دونیا و دوا ڕۆژ، کەواتە مەقاصیدی قورئانیش هەر ئەو ئامانجانەن کە لە پێناسەی مەقاصیدی شەریعە دا هاتووە، بەڵام دەبێ بزانین مەقاسیدی قورئان فروانترە لە مەقاسدی شەریعە، وە بێ چەند و چونە،

---

(١) ئەم بابەتە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی نییە بە بابەتە سەرەکییەکەی ئێمەوە (هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام)، بەڵام بەدەرفەتمان زانی لێرەوە باسی ئەم بابەتە گرینگ و پێویستە بکەین، چونکە زۆرێک لە کێشە و هەڵە تێگەیشتنەکانمان چارەسەر دەکات.

سەرچاوەکەشی بێ گرفتە، بەڵام کە باسی شەریعە بکەین سەرچاوەکانی تریش دێنە ناو، کە ڕوونە زانایان لەسەر هەموویان کۆک نین.

## مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی قورئان

مەبەست و ئامانجەکانی قورئان یەکجار زۆرن بەڵام ئێمە لێرەدا چەند دانەیەکی گرینگ باس دەکەین:

**١.** معرفة الله وعبادته وتوحيده: ناسین و پەرستشی خوای گەورە، گەورەترین ئامانجی قورئان ئەوەیە کە ئێمە خاوەنی خۆمان بناسین، بیپەرستین، ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنین، خۆشمان بوێت، لێی بترسین، بزانین مافی چییە بەسەرمانەوە، ئەرکمان چییە بەرامبەری، بەکام ڕێگایە پێی بگەین، چ کەسێک بە ئەومان شاد دەکات، چۆن بۆی بژین، چۆن لەدەستی نەدەین، چۆن تامەزرۆی لیقای بین، چۆن بەختەوەریمان لەناسینیدا بدۆزینەوە؟... {وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} (الذاريات: ٥٦).

**٢.** تزكية النفس وتربيته: پاككردنەوەی نەفس و دڵ و دەروون، دووەم ئامانجی قورئان پەروەردەکردنی مرۆڤە، ئەوەیە کە ئەم مرۆڤە پێگە و پایەی خۆی بزانێت، ئەرکی خۆی بزانێت، چۆن ببێتە ڕەحمەت بۆ دروست کراوەکانی تر، نەبێتە زەحمەت و مەینەت و ئازار، چۆن دەوری خۆی ببینێت، چونکە ئەگەر مرۆڤ پەروەردەکراو بێت ژیان خۆش و ئارام دەبێ، ستەم و بێدادی نابێت، مرۆڤەکان تام لە بوونیان دەکەن، تەمەننای مردن ناکەن وەک ئەمڕۆ کە دەبینین و دەبیستین، {قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا} (الشمس: ٩).

**٣.** تعمير الارض: ئاوەدان کردنەوەی زەوی و خۆش کردنی ژیان و ژینگە. {هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ} (هود: ٦١).

**٤.** مقصد ابتلاء الانسان: ئامانجی تاقی کردنەوەی مرۆڤ، بەداخەوە زۆر کەس بە هەڵە لەمە تێدەگات، بەڵام بەڕاستی تاقی کردنەوەی مرۆڤ و دەرفەت پێدان و ئازادی پێدانی گەورەترین ڕێزە بۆ مرۆڤ، چۆن؟ چونکە هەموو مرۆڤایەتی تاقیکردنەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان بەشانازی دەزانێت، ئەگەر کەسێک بێ تاقیکردنەوە پلەیەک، پۆستێک، شەهادەیەک، بەدەست بێنێت خەڵک متمانەی پێ ناکەن و گاڵتەی پێ دەکەن، تاقیکردنەوەکە لە توانای مرۆڤ دایە، پرسیارەکان بە هەموو کەس وەڵام دەدرێنەوە، ئەوەی کە ژیری هەبێت و (مكلف) بێت، پرسیارەکان: خوات کێیە؟ پیغەمبەرت کێیە؟دینت چییە؟ لەسەر ئەم زەوییە پرسیاری ئەوا ئاسان نییە، بەمەرجێ پرسیارەکان وەڵام دراونەوە، بەس بیان پارێزە، هەموو ئەو کەسانەش کە دەرفەتی پێگەیشتن و تێگەیشتنی ئەو پرسیارانەی نەبوو خوای گەورە سزای نادات. { وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا} (الإسراء: ١٥)، بەڵگەکانی ئامانجی تاقیکردنەوە زۆرن لەوانە: { لَّذِى خَلَقَ لْمَوْتَ وَلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ لْعَزِيزُ لْغَفُورُ} (الملك: ٢).

**٥.** مقصد تحقيق العدالة: ئامانجی پیادەکردنی دادگەری لە هەموو بوارەکان یەکێکە لە ئامانج و مەبادیئە بنچینەییەکان. { لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ لْكِتَٰبَ وَلْمِيزَانَ لِيَقُومَ لنَّاسُ بِلْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا لْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ للَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِلْغَيْبِ إِنَّ للَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ} (الحديد: ٢٥).

**٦.** مقصد كرامة ا لإنسان: هێنانە دی ڕێز بۆ مرۆڤ، ئەم کەرامەتە بۆ هەموو مرۆڤێکە، { وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى لْبَرِّ وَلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ لطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا} (الإسراء: ٧٠)

**٧.** مقصد التعارف فى جعل الناس شعوبا وقبائل مختلفا: یەکترناسینی هەموو مرۆڤەکان و مرۆڤایەتی، {يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ} (الحجرات: ١٣).

**٨.** مقصد التعاون بین الناس وإن كانوا مختلفین فى العقائد والمصالح: یارمەتیدانی یەکتری با جیاوازیش بین لە یەکتری لە بیرکرنەوە و ئایین و بیروباوەڕ و ...، {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ} (المائدة: ٢). مرۆڤەکان ناتوانن بەبێ یەک بژین، وە پێویستییان بەیەک دەبێت، با لە بیروباوەڕ و بیروڕاش جیاواز بن.

**٩.** مقصد الحریة: هێنانەدی ئازادی، ئازادی چ لە بیروباوەڕ بێت یان لە بیروڕا بێ، شەریعەت هاتووە دابینی بکا، بوونی مرۆڤ بە بیروباوەڕیەتی، ئەگەر نەتوانێ مومارەسەی بیروڕا و بیروباوەڕی بکات، بوونی هیچ واتایەکی نییە. {لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ} (البقرة: ٢٥٦) . { وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ} (الحج: ٤٠).

ئەم ئایەتە پیرۆزە و ئایەتەکانی پێشتر بێ پێچ و پەنا باسی ئازادی بیروباوەڕ دەکەن، وە یەکێک لە ئامانجەکانی ئیسلام بەرگری کردنە لە پیرۆزییەکانی خەڵک جا شوێنی جولەکە بێت وەک (بیع)، یان مەسیحیەکان (صوامع)، یان هی مسوڵمانەکان بێ وەک (مسجد)، یان هی هەموو دینەکان بێ وەک (صلوات)، هەرچەند موفەسیرەکان ڕاڤەی جۆراوجۆریان بۆ ئەم وشەیە کردووە، بەڵام من پێم وایە باشترین

ڕاڤە ئەوەیە کە مەبەست لە پیرۆزییەکانی دینەکانی هەموو دونیا بێت نەوەک دینێک بە تەنیا، چونکە هەرکەس دینی هەبوو هەر دینە با ڕاستیش نەبێت، مادام بەلایەوە پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێ، {لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ} (الكافرون: ٦).

**١٠.** مقصد حفظ الدين: پاراستنی ئایین، دیارە ئەوەیان جیاوازە لە خاڵەکەی پێشتر، ئەوەی پێشتر بۆ ئازادییە، بەڵام ئەوەیان بۆ پاراستنە، پاراستن بە دوو شێوە دەبێت، شێوەی یەکەم، بۆ دامەزراندن و بڵاو کردنەوە و ڕوون کردنەوەی، شێوەی دووەم، بە بەرگری لێکردن و پاراستنیەتی، {وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ} (البقرة: ١٩٣).

**١١.** مقصد حفظ النفس: پاراستنی گیانی مرۆڤ، جا هەر بیروباوەڕێکی هەبێت لە ئامانجە گەورەکانی قورئانە، بۆیە خوای گەورە سزای قورسی داناوە بۆ ئەو کەسانەی دەست درێژی دەکەنە سەرگیانی مرۆڤ یان ئەندامێکی یان مافێکی. { يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ } (البقرة: ١٧٨). {وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ } (البقرة: ١٧٩). وە ئەوە بەس بۆ بڕوادار نییە، خوای گەورە دەفەرمویێت: القتلى، وە دەفەرمویێت: {وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا} (الإسراء: ٣٣).

**١٢.** مقصد حفظ العقل: پاراستنی ژیری مرۆڤ یەکێک لە ئامانجە گەورەکانی ئیسلام و قورئانە، چونکە مرۆڤ بەهۆی ژیرییەکەی بەرپرسیارە لە دونیا

و دواڕۆژ، بۆیە هەرشتێک زیان بە ژیری مرۆڤ بگەیەنێت شەریعەت قەدەغەی کردووە، وەک مەی خواردنەوە، تلیاک، حەشیش، هەموو ئەو دەرمانانەی بێ پێویستی مرۆڤ بەکاریان دەهێنێت، {يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ} (المائدة: ٩٠). {إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ} (المائدة: ٩١).

**١٣.** مقصد حفظ المال: پاراستنی ماڵ و سەروەت و سامان، ژیان بە ماڵەوە بەردەوامە و ڕاوەستاوە و پێش دەکەوێت، { وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا .......} (النساء: ٥). بۆیە گرنگە هەم ڕێگای بەدەست خستنی شەرعی بێت، وە هەم ڕێگای خەرج کردنی، وە هەموو جۆرەکانی دەست درێژی بۆسەر ماڵی خەڵک قەدەغە کراوە و سزای بۆ دانراوە، {وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ } (المائدة: ٣٨)، بە داگیر کردن بێت، یان بەگەندەڵی، یان بەهەر شێوەیەکی دیکە.

**١٤.** مقصد حفظ النسل: پاراستنی وەچەی مرۆڤ لە ئامانجەکانی قورئان و ئیسلام و شەریعەتە، بۆ ئەوەی جۆری ئینسانی بە شێوەی تەندروست بمێنێتەوە خوای گەورە هەموو جۆرەکانی لادانی جنسی قەدەغە کردووە، خوای گەورە زینای حەرام کردوە و سزای بۆ داناوە کە جەڵدە لێدانە، { ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ} (النور: ٢). وە هەتا بوختان کردنی قەدەغە کردووە و سزای بۆ داناوە، {وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ

بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُواْ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ} (النور: ٤)، وە ئافرەتی داوێن پیسی قەدەغە کردووە لە پیاوی داوێن پاک، بەپێچەوانەشەوە، {ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ} (النور: ٣). واتە: پیاوی زیناکار مارەی ناکات تەنها ئافرەتی زیناکار و ئافرەتی موشریک نەبێت، وە ئافرەتی زیناکار مارەی ناکات پیاوی زیناکار یان پیاوی موشریک نەبێت، ئەو مارەکردن و شووکردن بە زیناکارە یا ساغ کراوە لەسەر ئیمانداران. وە دەفەرموێت: { ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ} (النور: ٢٦). واتە: ڕاستە ئافرەتانی ناپاک بۆ پیاوانی ناپاک وە پیاوە پیسەکان بۆ ئافرەتە پیسەکان وە ئافرەتە پاکەکان بۆ پیاوە پاکەکان وە پیاوە پاکەکان بۆ ئافرەتە پاکەکان، ئەو پاکانە بەری کراون لەو تۆمەتانەی ناپاکان دەیڵێن، بۆ ئەو پاک و چاکانە لێبووردن و ڕۆزی چاک و پیرۆز هەیە، واتە بەهەشت.

وە خوای گەورە دابین کردنی پرۆسەی زەواجی پێویست کردووە لەسەر دەسەڵات و کۆمەڵگە و دەست ڕۆیشتووەکان، {وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ }(النور: ٣٢) واتە: ژن مارە ببڕن بۆ پیاوانی بێژن و ژنانی بێ مێردیش بدەن بە شوو (مێرد)، هەروەها ئەوانەی ئیمان دار و چاکن لە کۆیلەکان (ژنیان بۆ بێنن) و کەنیزەکەکانیش بدەن بەشوو، ئەگەر ئەوان هەژار و کەم دەست بن خوا لە بەخشندەیی و بەهرەی خۆی دەوڵەمەند و بێ نیازیان دەکات، وە خودا بەهرە فراوان و زانا و دانایە.

وە پێویستی کردووە ئەوانەی ناتوانن زەواج بکەن خۆیان بپارێزن، {وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} (النور: ٣٣). واتە: وە دەبێ ئەوانەی کە توانای (ئەرکی) ژن هێنانیان نییە پاکژ خۆیان ڕاگرن هەتا خوا بە بەهرە (و ڕۆزی) خۆی بێ نیازیان دەکات وە ئەوانەی داوای نوسراو دەکەن (بۆ کڕینەوەی خۆیان) لە بەندە و کەنیزەکەکانتان ئەوە نوسراویان لەگەڵدا بنوسن (بۆ کڕینەوەو ئازاد بوونی خۆیان) ئەگەر خێرتان لەواندا بەدی دەکرد (کە بریتی یە لە توانای دانی ئەو پارەی ئەبێ بیدات بە خاوەنەکەی بۆ ئازاد بوونی) وە لەوماڵەی کە خوا بە ئێوەی داوە پێیان بدەن وە کەنیزەکەکانتان زۆر لێ مەکەن (ناچاریان مەکەن) لەسەر زینا کردن ئەگەر ئەیانویست داوێن پاک بن تا ماڵ و سامانی ژیانی دنیاتان دەست کەوێت جا هەرکەس ناچاریان بکات (زۆریان لێ بکات) ئینجا بەڕاستی خوا دوای ئەو زۆر لێ کردنەیان لێبووردەی میهرەبانە (بەو کەنیزەکانە کە بە زۆر زینایان پێ کرا) وە پێشەکییەکانی زینای پێش پێ گرتووە. {وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا } (الإسراء: ٣٢) واتە: نزیکی زیناش مەکەونەوە بەڕاستی ئەوە کردەوەیەکی زۆر ناشرین و ڕێگەیەکی پیس و خراپە. فەرموویەتی توخنی زینا مەکەون.

**١٥.** مقصد الهداية: یەکێک لە ئامانجە پیرۆز و سەرەکییەکانی قورئان هیدایەتە، {إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا } (الإسراء: ٩) واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێباز و بەرنامەیەک کە ڕاسترینە و

موژدەش دەدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن کە بە ڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە، ئەم هیدایەتە گشتگیرە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان .

**١٦.** مقصد الشفاء: یەکێ لە وەسفی قورئان ئەوەیە کە شیفا و چارەسەرە بۆ ڕووح و بۆ لاشە، بەڕاستی قورئان شیفایە بۆ نەخۆشی بیروباوەڕ، دەردی بەدڕەوشتی، کۆمەڵایەتی، خێزانی، تاکی، {وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا} (الإسراء: ٨٢). واتە: وە لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەوە ئەوەی کە هۆی شیفاو میهرەبانییە بۆ بڕواداران بەڵام (هاتنی ئەم قورئانە) بۆ ستەمکاران هیچ زیاد ناکات جگە لە خەسارەت مەندی.

{وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُواْ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ءَا۬عْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدًى وَشِفَآءٌ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ} (فصلت: ٤٤). واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان بە زمانێ جگە لە عەرەبی بناردایە بێ باوەڕان دەیان وت بۆچی ئایەتەکانی بەڕوونی شی نەکراونەتەوە (چۆن دەبێ) قورئانی عەجەمی و پێغەمبەری عەرەبی (ئەی موحەممەد (صلی الله علیە وسلم)) بڵێ: قورئان بۆ کەسانێ باوەڕیان پێی هێناوە ڕێبەرو چارەسەری گومانە وە ئەوانەی باوەڕی پێ نایەنن لە گوێیاندا گرانی و کەڕی هەیە (لە بیستنی حەق) هەروەها لە ئاست ئەو قورئانەدا کوێرن ئەوانە لە شوێنێکی زۆر دوورەوە بانگ دەکرێن.

**١٧.** مقصد الرحمة والتراحم: ڕەحم و سۆز و بەزەیی و بەزەیی هاتنەوە بە یەکتری، قورئان وەسفێکی ئەوەیە کە ڕەحمەتە بۆ تاک و کۆمەڵگە و .... وە دەیەوێت ئەم رەحمەتە ڕەنگ بداتەوە لە دەیان

دەقدا، {يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ } (يونس: ٥٧). واتە: ئەی خەڵكینە بێگومان بۆتان هاتووە ئامۆژگاری (قورئان) لە لایەن پەروەردگارتانەوە وە شیفا و چارەیە بۆ ئەوەی لە ناو دڵ و دەروونتان دایە وە ڕێنموونیی و میهرەبانیە بۆ بڕواداران.

**١٨.** مقصد إقامة الحجة على الإنس والجان: عوزر نەهێشتن بۆ مرۆڤ و جنۆكەكان، قوڕئان هاتووە بۆ ئەوەی ڕێنمایی بێت بۆ مرۆڤایەتی و بەرچاو ڕوونییان بكات لە هەموو پێداویستییەكانی ژیان بۆ دین و دونیا، بۆ دونیا و دوا ڕۆژ، {رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا} (النساء: ١٦٥). واتە: پێغەمبەران(مان ناردووە) كە موژدە دەرن و ترسێنەرن بۆ ئەوەی بۆ خەڵكی نەبێت بەڵگە بەسەر خواوە دوای(ناردنی) پێغەمبەران وە خوا هەمیشە زاڵی كار دروستە.

**١٩.** مقصد تعليم وتعلم الجدال باللتى هى أحسن: گفتوگۆ فێركردن بە جوانترین شێوە، لەوانەیە هەندێ كەس ئینكاری ئەو ئامانجە بكات، بەڵام بەراستی زۆر ئامانجێكی گەورەیە، چونكە گەورەترین جۆری هیدایەت لەڕێی بەیان و گفتوگۆوە دەبێت، { ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ} (النحل: ١٢٥) واتە: خەڵكی بانگ بكە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لە گەڵیان بدوێ (موجادەلە بكە) بدوێ بەچاكترین شێوە بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ بەوانەی گومڕابوون و لایاندا وە لە ڕێگاكەی وە هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن.

ئەم ئایەتە پیرۆزە جوانترین شێوازەکانی جیدالمان فێردەکا، وتەی جوان و سەرنج ڕاکێش، لێزانی و لێهاتویی و هەڵبژاردنی کات و شوێن و ئەندازە و جۆری حیوارەکە، ئەوجار لەجوانترین شێواز و بەرزترین ئاستی ئەخلاقی دابێ، وە ئامانج تێیدا گەیشتن بە هەق و ڕاستی بێت، خوای گەورە بۆ گەیشتن بەڕاستی دوو ڕێگامان نیشان دەدات کە سێ یەمی نییە، {قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ } (سبأ: ٤٦) واتە: بڵێ من تەنیا بەیەک شت ئامۆژگاریتان دەکەم کە دوو دوو یەک یەک لەبەر خوا هەڵسن پاشان بیربکەنەوە هاوڕێکەتان (پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)) شێت نی یە ئەو (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) تەنیا ترسێنەرە بۆ ئێوە لە پێش هاتنی سزای سەختی قیامەت.

چونکە هەریەکێ بیەوێت بگات بەڕاستی یان دەبێ لەگەڵ یەکێکی دانا و زانا گفتوگۆ بکات، یان دەبێ بەتەنیا دابنیشێت و بیربکاتەوە و خۆی لە بڕیار و قەناعەتی پێش وەختە دابڕنێت، ئەگەر وای کرد حەتمەن دەگات بەڕاستی.

**٢٠.** مقصد الانصاف مع الموافق والمخالف: ئینساف بوون لەگەڵ هەموو خەڵک، قورئان زۆر پێداگری دەکات لەسەر دادگەری و ئینساف هەتا لەگەڵ ناحەزەکانیش، قورئان دەفەرموێت: { قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ }(سبأ: ٢٥). واتە: بڵێ: پرسیارتان لێ ناکرێ لە تاوانێ کە ئێمە کردوومانە ئێمەش پرسیارمان لێ ناکرێ لەوەی ئێوە دەیکەن.

